




# خۆشەویستی

## لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە

لێکۆڵینەوەیەکی تیۆرییە لەسەر خۆشەویستی

هێمن محمد زۆراب








# بسم الله الرحمن الرحيم

## ( وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ)

**صَدَقَ اللهُ العظيم**

**سورة اليوسف الآية : ٣٠**







حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی خوێندنی باڵا وتوێژینەوەی زانستی
زانکۆی گەرمیان
فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتیەکان و وەرزش
بەشی دەروونناسی

**بڕیاری سەرپەرشتیار:**

**بڕیارمدا بە پەسەندکردنی ئەم تۆیژینەوە بەناونیشانی {خۆشەویستی لە ڕوانگەی دەروونناسیەوە} کە پێشکەش کراوە لەلایەن خوێندکار (هێمن محمد زۆراب) ، ئامادەکراوە لەژێر سەرپەرشتی مندا لە فاکەڵتی زانستە مرۆڤایەتیەکان و وەرزشزانکۆی گەرمیان ، بەشێکە لە پێداویستییەکانی وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە دەروونناسیدا .**

واژۆ :
سەرپەرشتیار
د . دونیا طیب رضا
بەروار: / /٢٠١٥

واژۆ
سەرۆکی بەشی دەروونناسی
د. سەرمەد صلاح محی الدین
بەروار: / / ٢٠١٥

# پێشکەش کردن :

♥ پێشکەشە بە باوک و دایکی خۆشەویستم کە هاوکارم بوون لە تەواو کردنی پرۆسەی خوێندن .

♥ پێشکەشە بە خوشك و برا خۆشەویستەکانم .

♥ پێشکەشە بە هەناسەی ژینم ( ئەوین )

♥ پێشکەشە بە مامۆستای سەرپەرشتیار ( د . دونیا طیب رضا ) کە هاوکاری زۆری کردووم .

♥ پێشکەشە بە سەرجەم مامۆستایانی بەشی دەروونناسی و خوێندکارانی بەشی دەروونناسی ,

♥ پێشکەشە بەو کەسانەی کە خۆشەویستی بە شێوەیەکی ڕاستەقینە دەکەن و خۆشەویستی لە دڵیاندایە .

هێمن محمد

# سوپاس و پێزانین :

♥ سوپاس بۆ خوای گەورە کەوا تەمەنی پێبەخشیم و یارمەتی دام تاوەکو بە سەرکەوتوویی خوێندن تەواو بکەم و ئەم توێژینەوەیە تەواو بکەم .

♥ سوپاس بۆ سەرپەرشتیاری توێژینەوەکەم (د. دونیا طیب رضا)

♥ سوپاس بۆ مامۆستایانی بەشی دەروونناسی بە تایبەت :

(د . سرمد صلاح , د . ندوی شریف , د . ئاریان قادر)

♥ سوپاس بۆ کتێبخانەی زانکۆی خانەقین و کتێبخانەی هەڵەبجە .

♥ سوپاسی بێ پایان بۆ توێژەر ( پێزان عبدالله ) کە هاوکارییەکی زۆری کردم هەر لە دیاری کردنی ناونیشانی توێژینەوە تا کۆتا سەرچاوە.

♥ سوپاس بۆ دەستگیرانە خۆشەویستەکەم ( ئەوین ) کە هاوکاری زۆری کردم لە پەیدا کردنی سەرچاوە و زۆر ماندوو بوو پێوەی .

♥ سوپاس بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بە وشەیەکیش بێت هاوکارم بوون لە تەواو کردنی ئەم توێژینەوەیە

هێمن محمد




# پوختەی توێژینەوە :

خۆشەویستی یەکێکە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و کاریگەری دەروونی و کۆمەڵایەتی و فسیۆلۆجی هەیە لەسە کەسایەتی مرۆڤ , خۆشەویستی ئەو بابەتەیە کە لەلایەن زۆرێك خەڵکییەوە بە شاراوەیی یان بە هێڵی سوور دانراوە کە ئەمە بەهۆی تێنەگەیشتنە لەم چەمکە , هەر بۆیە هەوڵمداوە لە ڕێگەی ئەم توێینەوەیەوە ڕووی ڕاستەقینەی ئەم چەمکە بخەمە ڕوو . خۆشەویستی یەکێکە لە هەستە هەرە خۆشەکانی مرۆڤ کە کۆمەڵێك هۆکار و پاڵنەری لە پشتەوەیە کە وا دەکات مرۆڤ هەست بە خۆشی بکات لە هەمان کاتدا ناخۆشیشی هەیە .

ئەم توێژینەوەیە توێژینەوەیەکی تیۆرییە و لە چوار بەشی سەرەکی پێك هاتووە ئەوانیش :

بەشی یەکەم / کێشە و گرنگی و ئامانج و سنووری توێژینەوە و دیاری کردنی زاراوەکان , وە لە دیاری کردنی زاراوەکاندا سەرەتا چەمکی خۆشەویستیمان کردووە و پاشان چەمکی دەروونناسی.

بەشی دووەم / ئەمیش پێك هاتووە لە سەرەتایەك لەسەر خۆشەویستی و دواتر خۆشەویستی لە شارستانی یۆنان و ئاینی مەسیحی و ئاسنی ئیسلام و لای عەرەب و ئەورووپا و کورد و دوا بە دوای ئەمانە تیۆرەکانی خۆشەویستی دێن .

بەشی سێیەم / ئەمیش پێك هاتووە لە چەند بابەتێك ( حەز و خۆشەویستی و عەشق ) و دواتر باس لە ( خۆشەویستی و سێکس ) دەکەین , دواتر پاڵنەرەکان و نیشانەکان و خاسیەتەکانی خۆشەویستی باس دەکەین .

بەشی چوارەم / کۆتا بەشیش کۆمەڵێك بابەتی تر لە خۆ دەگرێت کە قۆناغەکان وجۆرەکان و زیانەکان و چارەسەری خۆشەویستی و پاشان دەرئەنجام و ڕاسپاردە و پێشنیار دێت و لە کۆتاییشدا سەرچاوەکانی توێژینەوە .

وە لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیە ئاماژەمان بە کۆمەڵێك دەرئەنجام کردووە کە لەم توێژینەوەیە دەستمان کەوتووە لەوانە :

– خۆشەویستی هەستێکە کە هەموو مرۆڤێك هەستی پێ ناکات بەڵکو ئەو کەسانە هەستی پێ دەکەن کە چەشتوویان و دەیچێژن ، وە ناتوانین پێناسەیەکی دیاری

کراوی بۆ بکەین چونکە بەقەد ژمارەی مرۆڤەکان ئەشێت پێناسەی خۆشەویستی هەبێت .

– ( حەز و خۆشەویستی و عەشق ) سێ شتی جیاوازن و هەریەکەیان مەبەستێکی خۆی هەیە کە ئەتوانین بڵێین : حەز تاکەکەسییە و وەك نێرگزی وایە ، خۆشەویستی دوو کەسییە و لە نێوان دوو کەسدایە وە بەلاّم عەشق لە نێوان کەسێك و خودادایە .وە کۆمەڵێك دەرئەنجامی تر کە لە توێژینەوەکە ئاماژەمان پێداون

هەروەها کۆمەڵێك ڕاسپاردەمان خستوەتە ڕوو لەوانە :

– ئاسانکاری بکرێت بۆ ئەو کەسانەی کە یەکیان خۆش دەوێت بۆ ئەوەی هاوسەرگیری بکەن و بەربەست و تەگەرە نەخەنە ڕێگەیان .

– پێویستە لەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن کە فلیم و زنجیرەی ڕۆمانسی کەم بکەنەوە و لە جێگەی ئەوانە بەرنامەی زانستی و سوود بەخش پەخش بکەن .

وە لە کۆتاییدا دوو پێشنیارمان کردووە بۆ ئەو کەسانەی دوای ئێمە توێژینەوە ئەنجام دەدەن ئەوانیش :

١– توێژینەوەیەك ئەنجام بدرێت کە بە شێوەیەکی فراوان جیاوازی بکات لە نێوان خۆشەویستی ڕاستەقینە و خۆشەویستی درۆینە.

٢– توێژینەوەیەکی مەیدانی ئەنجام بدرێت لەسەر کاریگەری داب و نەریتی کۆمەڵگای کوردی و ڕەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندی خۆشەویستی .




# پێرستی ناوەڕۆك


ط




# بەشی یەکەم :

- کێشەی توێژینەوە

- گرنگی توێژینەوە

- ئامانجی توێژینەوە

- سنووری توێژینەوە

- دیاریکردنی زاراوەکان




# بەشی یەکەم

## * کێشەی توێژینەوە :

لە کۆمەڵگای ئێمەدا ، تا ئێستە زۆر بە سادەیی و بەبێ قوڵبوونەوە و تێگەیشتن لە چەمکی خۆشەویستی و ژیانی هەستەوەری قسەکراوە ، ڕەنگە بەشێکی زۆر قسەکردنەکانمان وەسفکردنی خۆشەویستی بووبێت لە زمانی شیعرەوە و قوڵبوونەوە نەبووبێت لە ڕووی فیکر و سایکۆلۆژیەوە ، و ئەوەش دووچاری بەدبەختی کردووین لەوەی بتوانین سەرچاوە گەلێکی ئەوتۆ بەدەست بهێنین بۆ ئەوەی بتوانین بۆ نووسینی لێکۆڵینەوەیەك سوودی لێ وەربگرین ، چونکە خۆشەویستی و ژیانی هەستەوەری پەیوەندی بە هەموو تاکەکانی هەر کۆمەڵگایەکەوە هەیە و لاوازی و تێنەگەیشتن لە مانای ڕاستەقینەی خۆشەویستی دووچاری نامۆبوون و ئازاری دەروونیمان دەکات . لەگەڵ ئەوەی لێرە و لەوێ هەندێك لە ڕۆشنبیران و نوسەرانمان لە ڕێگەی گفتوگۆ ، یاخود کورتە وتار دوە خۆیان لە قەرەی ئەو لایەنە گرنگەی ژیانی تاکەکانی کۆمەڵگا داوە ، بەلآم دیسان ئەوەش بە و مانایە نییە کە بتوانین بڵێین لایەکی جیدیمان لە ژیانی خۆشەویستی و هەستەوەری کردووەتەوە و هەوڵماندا هەر نەبێت بتوانین خوێندنەوە و تێگەیشتنمان هەبێت بۆ ئەو چەمکە و ماناکانی پشتی ئەو چەمکە .( کەریم ، ٢٠٠٥، ل ٥)

چەمکی خۆشەویستی لە نێوان هەردوو ڕەگەزی ( نێر و مێ ) دا و لە ڕێی ئەو وێنەیەی کە دراوە پێی لە وشە و زاراوەی کلتووری باوی ڕۆژانەدا وەك هەڵبەستی وەسفکردن و پیاهەڵدان بەسەر خۆشەویست ، گۆرانی ، فیلم و زنجیرەی تەلەفزیۆنی ، لە هزری زۆرینەی هەرە زۆری خەڵکدا نزیك دەبێتەوە لە قەدەرێکی غەیبی کە بەبێ هیچ پێشەکیەك و داوای ڕوخسەتێك و بەبێ بوونی کەڵەکە بووی هۆکاری پێشوەختە دێتە پێش دوە ، وەك ئەوەی ڕووداوێکی سیحراوی دابڕاوبێت لە ڕووداوەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی ، لە هەموو کاتێکدا ئەشێت بەسەر هەموو مرۆڤێکدا بێت ، تووشی شەو نخونی و دڵەڕاوکێ و خەیاڵبردنەوە و جۆش و خرۆ ش بکات تا ئەو ڕادەیەی خودی خۆی لە ناو خودی کەسی خۆشەویستدا لەناو بەرێت ، بەلآم ئەم خۆشەویستییە بەڵگە و مانای شاراوە و ڕاڤەکردنی جیای هەیە کە لە ڕووی سایکۆلۆجی سەردەمەوە جیاوازن. ( نظمي،٢٠١٠،ص١٥)




بە گشتی لە کۆمەڵی ئێمە و لە ئیمڕۆدا بوونی خۆشەویستی ڕاستەقینەی ڕۆحی نێوان دوو مرۆڤ تەم و مژاوی و بگرە لە قەیراندایە ، ئەمەشە بۆتە هۆی ئەوەی ئەو باسەی ئەوەندەی وەك زمانی وەسفکردن باسی لێوە دەکرێت ، وەك واقیعێکی جوان و پێویستی مرۆڤەکانە پەی بە هەستەکانی نەبرێت بەوەی ژیان بێ بوونی خۆشەویستی هیچ مانایەك نابەخشێت . ئەمە جگە لەوەی تێڕوانین بۆی لە لایەن زۆرێك لە مرۆڤەکانەوە ڕووکەشانە و ڕواڵەتکارانە و تەقلیدییانەیە ، یان بەرژەوەندی خوازانەیە و دەتوانم بڵێم تەنانەت جۆرێك لە خودپەرستی و وەهمێکی جوان کە بەشێك لە مرۆڤەکان بە خەیاڵ پیادەی دەکەن و نەبوەتە وەلأمدانەوەیەکی ڕاستگۆیانەی نێوان مرۆڤەکانە و بگرە تا ئێستاش ژینگەی پەروەردەکردنمان بۆ تێگەیشتنی مرۆڤەکان لە خۆشەویستی لەسەر بنەمای ترس و دڵەرشاوکێ و تۆقاندنە ، بە تایبەت بۆ ژنان بەوەی پیادەکردنی لە ئاکامدا دەبێتە هۆی قوربانی و باجی گەورە و لە کۆتاییدا کوشتنی مرۆڤەکانی لێ دەکەوێتەوە ، ئەمە وێڕای ئەوەی زۆرجار ئەو پەیوەندییە کارەسات بەدوای خۆیدا ڕاکێش دەکات . ( عبداللە ، ٢٠١٤، ل ١٠-١١)

لە کۆمەڵگای ئێمەدا دەتوانین بڵێین لای زۆرێك بە تایبەت ئەو کەسانەی کە بە تەمەنن چەمکی ( خۆشەویستی ) هێڵی سوورە و نابێت لێی نزیك بکەوینەوە بە پێچەوانەشەوە تووشی چەندین کێشە دەبین ! هۆکاری ئەمەش بەکارهێنانی ( خۆشەویستی)یە بە شێوەیەکی هەڵە لە لایەن کەسانێکەوە کە واتا ڕاستەقینەکەی خۆشەویستیان تێك داوە هەر بۆیەشە ئەو کەسانەی یەکیان خۆشدەوێت بە ڕاستی بە شێوەیەکی نهێنی ئەم خۆشەویستییە دەهێڵنەوە و نایدرکێنن.

## * گرنگی توێژینەوە :

خۆشەویستی مرۆڤ وەك دراوێکی دوو دیو وایە هیچ کامیان بێ ئەوەی دی ژیان ناگوزەرێنێت و هەردووکیان پێکەوە ژیان پێك دەهێنن و مانایەك بە ژیان دەبەخشن ، لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵە مرۆییەکان خۆشەویستی بوونی هەبووە و بە پێی قۆناغەکانی شیکاری و تێڕوانینی جیاوازی لە مەڕ کردووە . (عبداللە ، ٢٠١٤ ، ل ٢١ )




وەك ئاشكرایە خۆشەویستی بە مانا فراوانەكەی مانا گەلێك دەبەخشێت و بە پێی پۆلێنكردنی كەس و شوێن و شتگەلەكانیشەوە جیاوازی بە خۆوە دەبینێ ، بۆ نمونە دەشێت خۆشەویستی بۆ گەل ، نیشتیمان ، مرۆڤ ، ڕەگەزی بەرامبەر بێت یان باوك و دایك و منداڵ و هاوسەر و هاوڕێ و خۆشەویستی مرۆیی و خودایی .... هتد .

ئەوەی باسەكەی منە خۆشەویستی نێوان هەردوو ڕەگەزی جیاوازە كاتێك دەچنە نێو پرۆسەی خۆشەویستییەوە ، ئەمە جگە لەوەی خۆشەویستی نەك تەنها چەمكێكی زانستیە ، بەڵكو تێكەڵەیەكە لە زانستە جیاوازەكان كە بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ بێت یا نا ڕاستەوخۆ ڕۆڵ دەگێڕن لەسەرهەڵدانیان و بەو واتایەی چەندین مەودای فەلسەفی ، سایكۆلۆجی ، بایەلۆجی ، پەروەردەیی ، و ئاینی و شارستانی و سۆسیۆلۆجی ، ئابووری و زانستی .... هتد . مرۆڤەكان ئەگەر چی بێ خۆشەویستی ناژین ، بەڵام بەردەوام خۆشەویستی لە نێوان مرۆڤەكان لە نێو چەند تێڕوانینێكی جیاواز و دژ بە یەك ڕێدەكەن . (عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ٢١-٢٢ )

خۆشەویستی بەیەك گەیشتنی دوو كەسە لەسەر ڕێگای ژیان ، ئەو پەیوەندییە شاراوەیە ژن و پیاو پێكەوە گرێ دەدات كوڕ و كچێك ، هەروەها تا كۆتایی ، وە وادەكات لە هەریەك لەو دوانە كەوا بزانێت ئەوی تریان نیوەیەتی و بە درێژایی ژیانی بۆی دەگەڕێت ، وە هەر چاوی ئەو دوانەیە كە سەیری دونیای پێ دەكەن و بە جوانی و ڕازاوەیی بەختەوەری ژیان دەبینن ، وە چارەنووسی خۆیان پەیوەست كردووە بە داهاتووی ڕۆژانی دواییانەوە.(جرجیس ، ٢٠٠٤ ،ل١٥)

بێگومان خۆشەویستی سەرگەورەی هەموو سۆز و هەستەكانە و لە هەموویان سەرنجڕاكێشترە و فریودەرترە ،بەڵام لە هەمان كاتدا لە هەموویان زیاتر هەڵخەڵەتێنترە و دەبێتە مایەی نا ئومێدی . بەهێزترین چێژ و بەختەوەری بە مرۆڤ دەبەخشێت و بەڵام هاوكات توند ئازاریشمان دەدات ، خۆشیمان پێ دەبەخشێت وەك چۆن خەمیشمان دەداتێ . (ریوریكوف ، ٢٠٠٩ ، ل٢٠-٢١)

لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی خۆشەویستی ئافرەت هەست بە ڕەگەزی خۆی دەكات و پیاویش هەستی بە تواناكانی خۆی دەكات و ڕەنگە ئەوەش ئامێرێك بێت بۆ بەرزكردنەوەی هەستی




متمانـه بـەخودی کەسـێتی و هـەروەها یاریمەتیـدەرە بـۆ هەسـتکردن بـەوەی لـەلای خـەڵکی خۆشەویست و سەرنجڕاکێشێت . ( شحروم ، ٢٠١١، ل ١٧ )

ئەو دوانەی یەکتریان خۆشدەوێت ، بە قوڵایی دەروونی یەکتردا شـۆڕ دەبنـەوە و لـە هەموو چرکە ساتێکدا ئاگاداری یـەکترن وەك ئـەوەی پردێکـی نادیـار و نـەدیوی سـایکۆلۆجی ، کۆئەنـدامی دەمـاری هــەردووکیانی پێکــەوە گــرێ دابێـت ، کتــوپڕ بەرژەوەنــدی و خــەم و ئاواتەکانیان دەکات بە یـەك کەسـی خۆشویسـتراو بـەلای ئـەو کەسـەوە خۆشـیدەوێت یەکسـان دەبێت بە هەموو مرۆڤایەتی ، چونکە هیچ کەسێکی تر وەك ئەو ناتوانێت تینویەتی قوڵی گیانی ئەو بشکێنێت و پێداویستیـیە دەروونیەکانی تێر بکات . ( بۆکانی، ٢٠٠٨، ل١٤٨ )

خۆشەویسـتی تـەنیا مـەیل و ئـارەزوو و پەرۆشـی نییـە بـۆ مرۆڤێکـی دیکـە ، بـەڵکو خۆشەویستی لەوە قوڵترە و دوورتـر بـە نـاو نـاخی مرۆڤـدا تێپـەڕ دەبێـت و لـە سـاتە وەختـی ئـاوێزانبوونی ڕۆحـدا کـە بـاڵاترین لوتکـەی خۆشەویسـتییە هەسـت دەکـەیت ئـەو کەسـەی خۆشتدەوێت هەر خۆتە ، توشی گومان دەبیت تۆ لە ناو ئەودایت یا ئەو لە ناو تۆدایە ، لە دایك بوونی ئەم هەستەش لە دەروونی مرۆڤدا سەرتاپای ڕوانین و هەستەکانی دیکـەی دەگۆڕێـت. (ریوریکوف، ٢٠٠٩، ل٩٠٨ )

خۆشەویســتی و جــوانی ئاوێتــەی یــەکترن ، ئــەوەی خۆشەویسـتی دەکـات لایەنـە جوانەکانی ژیان زیاتر دەبینێـت بـە بـەراورد لەگـەڵ ئـەو کەسـەدا کـە خۆشەویسـتی ناکـات ، هەروەك ئەوەی جوانی تایبەت بێت بە خۆشەویستییەوە یان ڕوویەکی تری ئـەو هەسـتە بێـت ، لە پرۆسەی خۆشویستندا ، هەست و نەست و پەیبردنی مرۆڤ وای لێـدێت ببەرامبـەر بـە جـوانی ناسکی هەستیار بێت . ( بۆکانی ، ٢٠٠٨ ، ل ١٤٨ )

ئەلبیرۆنی دەڵێت : ( خۆشەویستی یاریمەتیمان دەدات لە گەشەکردنی ڕەفتارەکاندا کـە داخوازییەکانی ناوەوەمان بۆ دێنێتە دی ، هەروەها دەبێتـە هـۆی خێراکردنـی کـرداری گۆڕان و پێشکەوتن . ( بونیسون ، ٢٠٠٨، ل ٥٢ )




## * ئامانجی توێژینەوە :

ئامانجم لەم توێژینەوەیە خستنەڕووی ڕوویەکی زانستی و دەروونییە بۆ پەیوەندی خۆشەویستی نێوان ڕەگەزی نێر و مێ و دەرخستنی ئەو ڕاستیەی کە پەردەی لەسەر دراوە و بە شاراوەیی ماوەتەوە لای هەندێ کەسدا .

## * سنووری توێژینەوە :

سنووری ئەم توێژینەوەیە بریتییە لە خۆشەویستی نێوان هەردوو ڕەگەزی ( نێر و مێ ) لە قۆناغی ژیانی مرۆڤدا .

## * دیاری کردنی زاراوەکان :

### یەکەم خۆشەویستی :

### لە ڕووی زمانەوانییەوە :

* خورشید (٢٠١٣) بەم شێوەیە پێناسەی دەکات :

(( لە زمانی کوردیدا وشەی خۆشەویستی بە مانا ی حەزلێکدرنی بوونەوەرێکی زیندوو بۆ بوونەوەرێکی زیندووی تر بەکاردێت ، بۆ نمونە خۆشەویستی مرۆڤ بۆ دایك و باوك ، منداڵ یان هاوسەر هەروەها خۆشەویستی کوڕ بۆ کچ و بە پێچەوانەشەوە بەڵام حەزی بونەوەرێکی زیندوو بۆ شتێکی بێگیان پێی ناوترێت خۆشەویستی بەڵکو پێی دەوترێت حەزلێکردن)) .

( خورشید ، ٢٠١٣، ل ٢٨)

### لە ڕووی زانستییەوە :

**١-طاهر(٢٠١٤)**بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:

(( خۆشەویستی هێزێکی پاڵنەری دەروونییە لە دڵی مرۆڤەکاندا کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاریگەری دەبێت لەسەر هەڵسوکەوت و کرداریان بەرامبەر کەسانی دیکە)).(طاهر، ٢٠١٤ ، ل ١١)




**٢- شحرور(٢٠١١) :**

(( خۆشەویستی بریتییە لە هەستێكی بەهێز ، كە لە ڕێگەی حەز ، سۆز ، پەرۆشی ، هەستی یەكەم بۆ ڕەگەزی بەرامبەر)) . ( شحرور ، ٢٠١١،ل١٦ )

**٣- بۆكانی (٢٠٠٨):**

(( خۆشەویستی  پێكهاتەی كۆمەڵێك هەڵچوونە و لە كورتترین پێناسەیدا توانای بەخشینی بێبەرامبەرە ، مرۆڤ بە كردەوە ئەنجامی دەدات و بە قسە دەری نابڕێت و ناچێتە چوارچێوەیەكی بەرجەستەكراوی بیستراو یان خوێندراو)) . ( بۆكانی ، ٢٠٠٨،ل ١٥١)

**٤- عبدالقادر(٢٠٠٧) :**

(( خۆشەویستی بریتییە لە یەكسانی هەست لە نێوان دوو ڕەگەزدا یان دەتوانین بڵێین بریتییە لە یەكخستن بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی پاداشت بكەی)) . ( عبدالقادر ، ٢٠٠٧،ل١٦)

**٥- حەمەد (٢٠٠٤):**

(( خۆشەویستی داینەمۆی جوڵاندنەوەی هەست و سۆز و چێژی ناوەوەی كەسێكە بۆ كەسێكی دیكە ، پرۆسەیەكی ئاڵۆزی چالاكی مێشكە و ناوەندی مێشك لە هەموو كات ماندووتر دەبێت ، واتە خۆشەویستی خۆنەویستە و لە خودەوە فەرمانی پێدەكرێت)) .(حەمەد ، ٢٠٠٤، ل٥٥)

## دووەم : دەروونناسی :

**١- قەرەچەتانی ( ٢٠٠٧ ) :**

(( زاراوەیەكی لاتینییە و لە دوو وشە پێك هاتووە ( Psycho ) بە مانای دەروون ( Logy ) بە مانای زانست یان توێژینەوە و یان ناسین ، كەواتە سایكۆلۆژیا مانای دەروونناسی دەگرێتەوە یان زانستی دەروون )) .  (قەرەچەتانی ، ٢٠٠٧ ، ل ٣٣ )




**٢- عدس ( ٢٠٠٢ ) :**

(( ئەو زانستەیە کە گرنگی دەدات بە خوێندنی ڕەوشتی مرۆڤ بە هەموو جۆرەکانییەوە)) .

(عدس ، ٢٠٠٢ ، ل ٨ )

**٣- غوتریج ( ١٩٨٣ ):**

(( دەروونناسی لە مرۆڤ دەکۆڵێتەوە چۆن بیر دەکاتەوە ، چۆن شتی دێتەوە یاد، چۆن فێر دەبێت ، چۆن هەست دەکات و چۆن تێدەگات . هەروەها لە پێکهاتنی کەسایەتی و هەڵوێستی لە کۆمەڵدا و لە هەڵسوکەوتە نالەبارەکانی وەکو نەخۆشییەکانی ژیری دەکۆڵێتەوە)) . ( غوتریج ، ١٩٨٣ ، ل ٣ )

**٤- منصور ( ١٩٧٨ ):**

(( بریتییە لە توێژینەوەی زانستی ڕەوشتی مرۆڤ بۆ خۆسازدانی لەتەك ژینگە )).

( منصور ، ١٩٧٨ ، ص ١٠ )

**٥- راجع ( ١٩٦٥ ) :**

(( بریتییە لە لێکۆڵینەوەی هەڵسوکەوت کردارە عەقڵییەکان وەك ( بیرکردنەوە ، لەبیرچوونەوە ، هەڵچوون ، پاڵنەرە کەسایەتییەکان ، خەیاڵ ، هەست ، وریایی ) و چەند کردارێکی عەقڵی تر )). (راجع ، ١٩٦٥ ، ل ١٠ )

پێناسی توێژەر بۆ خۆشەویستی بریتییە لەو هەستەی کە مرۆڤ تا نەیچێژێت نازانێت چۆنە .




# بەشی دووەم :

- سەرەتایەك لەسەر خۆشەویستی
- خۆشەویستی لە شارستانی یۆنانیدا
- خۆشەویستی لە ئاینی مەسیحیدا
- خۆشەویستی لە ئاینی ئیسلامدا
- خۆشەویستی لەلای عەرەب
- خۆشەویستی لەلای ئەوروپا
- خۆشەویستی لەلای کورد
- تیۆرەکانی خۆشەویستی




# بەشی دووەم

## * سەرەتـایەك لەسەر خۆشەویستی :

وەك چۆن هەموو بونەوەرێك پێویستی ئەندامی هەیە وەك پێویستی بۆ نـان خـواردن و ئاو خواردنەوە و خەو و ئارامی و پێویستی سێکس ، هەروەها پێویستی دەروونی هەیە لەوانە ( خۆشەویستی و چاودێری و سۆز ) هەر یەك لەم دوو جۆرە پێویستییەش دەبێت پڕ بکرێتـەوە هەتا تاك هەست بە هاوسەنگی بکات و گەشەی تـەواو و ڕێـك بێـت ، وەك چـۆن کـەمی خـواردن دەبێتە هۆی کەم خوێنی ئەوا کەمی خۆشەویسـتی و سـۆز دەبێتـە هـۆی نەخۆشـی دەروونـی و هەروەها هەندێ کات نەخۆشی جەستەییش ، بـەبێ خۆشەویسـتی منـداڵ دەمرێـت و گـەورەش کـەم ئەنـدام و شـێواو دەبێـت لـە ڕووی دەروونییـەوە . وەك چـۆن دیکـارت دەڵێـت : (( **مـن خۆشەویستی دەکەم کەواتە من هەم** . )) ( بندق ، ٢٠١٠ ، ص ٥٠ )

هەر وەك پێشتر باسمان لێوە کردووە خۆشەویستی چەندین جۆری هەیە دەشـێ خۆشەویسـتی بـۆ خـودا بـۆ نیشـتمان بـۆ دایـك و بـاوك بـۆ منـداڵ …… بـەڵام ئـەوەی باسـەکەی ئێمەیـە خۆشەویستی نێوان ( نێر و مێ ) یە کە باسی لێوە دەکەین .

چەمکی خۆشەویستی ، ئەو چەمکەیە هەموو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئاشنایەتییان لەگەڵیدا هەیە و هەر مرۆڤێك بە جۆرێك ، لـەو چـەمکە گەیشـتووە و هـەوڵی مومارەسـەکردنی داوە ، نـاتوانین دەستنیشانی یـەك پێناسـەی دیاری کـراو بـۆ خۆشەویسـتی بکـەین و ناشـتوانین بڵـێین تـەواوی مرۆڤەکان لـە مانـای خۆشەویسـتی تێگەیشـتوون و لـەم تێگەیشـتنانەوە دەسـتی بـۆ دەبـەن و مومارەسەی دەکەن . ( کەریم ، ٢٠٠٥ ، ل ١١)

لەبـەر ئـەوەی خۆشەویسـتی لـە هەسـتی مرۆڤەکانـەوە سەرچـاوە دەگرێـت و پاشـان دەبێتە هێزێکی پاڵنەر بۆ کردارەکانی مرۆڤ ، ئا بۆ خـۆی دەبێـت بـە بەشـێك لـە کـردەوە بۆیـە دەتوانین بڵێین کە خۆشەویستی ناتوانرێت دەقێکی دیاری کراوی بۆ دابنرێت و بگوترێت ئەمـە پێناسـەکەیەتی ، بەهـەمان هۆکـار کـە خۆشەویسـتی هەسـت و غەریزەیـە بـۆ شـتەکان و چـێژ لێوەرگرتنیانـە بۆیـە نـاتوانین بـە وشـە وەسـفی بکـەین و سـنووری بـۆ دابنـێین ، بـۆ ئـەوەی دڵنیابوون لەمـەش ئەگـەر بێـت و ڕاپرسـییەك بکـەین لـە نێـوان مرۆڤەکانـدا ئـەوا هـەر کەسـە و

بۆچوونێکی جیاوازی دەبێت لەسەری ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر سنووردارکردنی خۆشەویستی.

( طاهر، ٢٠١٤ ، ل ٩ )

هەندێك بڕوایان پێی نییە یان بڕوایان پێی نەماوە هەندێکی تر بە پێشەوانەوە ، هەندێکیش پێیان وایە وزەیەکی زۆر لە مرۆڤ دەبات یان لە داهێنانی دەکات ، هەندێکیش پێیان وایە ژیانی نوێ و داهێنانی نوێ بە مرۆڤەکان دەبەخشێت . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ٢٢ )

هەندێکیش پێیان وایە نەخۆشی دەروونییە و کاری ئەو کەسانەیە کە بێ کارن و ئیشیان نییە و بێ ئیشن . ( بندق ، ٢٠١٠ ، ل ١٨ )

هەندێکیش دەڵێن خۆشەویستی تەنها خەیاڵە و هیچی تر ، هەندێکیش دەڵێن خۆشەویستی هەموو شتێکە وەك (( تشیسون )) ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەندێك پێیان وایە خۆشەویستی ئەو هەستەیە تاکو نەیچێژیت نازانی چییە و چۆنە هەر وەك أبن القیم دەڵێت : (( خۆشەویستی ناتوانرێت وەسفی بکرێت مەگەر بە چەشتنی نەبێت ))، وە هەروەها (( سیمون دی براڤۆ))یش دەڵێت (( خۆشەویستی شتێکە کەسێك دەیزانێت کە چێژتبێتی )). (نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١١ )

## * خۆشەویستی لە شارستانی یۆنانیدا :

لە شارستانی یۆنانیدا چەندین دەستەواژەی جیایان بۆ خۆشەویستی بەکار هێناوە کە هەریەکەیان مانا و مەبەستێکی دیاریکراوی تایبەت بە خۆی هەیە لەوانە :

- **ئاگاپە** : ئەم جۆرە خۆشەویستییە لای یۆنانییەکان بۆ ئاماژەکردن بە خۆشەویستی ئیلاهی دادەنرێت . ( کوئیلو ، ١٣٧٩ ، ص ١١٥ )

- **ئیرۆس** : بە شێوەیەکی باو بۆ ئاماژەکردن بە خۆشەویستی جەستەیی یان جوانی بەکاردێت. (CF.Morton، ١٩٦٢ ، p.١٩ )

- **فیلیا** : ئەم جۆرە بە [ خۆشەویستی برادەرانە – هاوڕێیانە ] دادەنرێت لای یۆنانییەکان کە ئەرستۆ زۆر باسی ئەم جۆرەی کردووە . ( أبراهیم ، ٢٠١٣ ، ل ٢٥٤ )

- **ستۆرگ** : بە خۆشەویستی سروشتی ناودەبرێت کە وەکو خۆشەویستی دایك و باوك بۆ منداڵەکانی و بە پێچەوانەشەوە . ( Hooper ، Lewis ، ١٩٩٦ ،p. ٣٦٩-٣٧٠ )




ئێمە لێرەدا باس لە ( ( ئیرۆس )) خۆشەویستی جەستەیی یان جوانی دەکەین کە تا ڕادەیەك پەیوەستە بە بابەتەکەمانەوە :

وەك وتمان سەیری هەر کتێبێکی ئاسایی بکەین دەربارەی خۆشەویستی دەبینین وشەی (( ئیرۆس)) بە شێوەیەکی باو بۆ ئاماژەکردن بە خۆشەویستی جەستەیی بەکاردێت (Hunt، ١٩٦٢، p.١٩ )

وشەی ((ئیرۆس)) وشەیەکی یۆنانی کۆنە وە لە هەموو زمانە ئەوروپییەکاندا بەکاردێت، وشەیەکە بۆ تەعبیرکردن لە عیشق و خۆشەویستی ، بەڵام ئەم وشەیە زۆر لەوە ئالۆزترە کە دەردەکەوێت . ئەگەر سەیرێکی خێرای دیالۆگەکانی ئەفلاتوون بکەین دەبینین کە (( ئیرۆس )) کۆمەڵێك مانای جیاواز لە خۆ دەگرێت ، لەوانە سۆز و مەحەبە و ئیشتیاق تێکەڵ بە جوانی جەستەیی و ئایدیای جوانی ، دێوانەیی . ( ڕەفیق ، ٢٠١٠ ، ل ٢٣ — ٢٤ )

وە هەروەها بە (( ئیرۆس )) دەوترێت خۆشەویستی وەرگر ( خۆشەویستییەك کە دەمانگرێت)، خۆشەویستییەکە تێیدا عاشقیش ، مەعشوقە ، لەبەر ئەوەی شتێك لە مەعشوقدا دەدۆزێتەوە لەبەر ئەوە نموونەی دیار و دەرکەوتووی ئەم جۆرە خۆشەویستییە ، خۆشەویستییەکە کە حەز و مەیلی جنس دەسەڵاتی تێدا هەیە . ( کۆمەڵێك نووسەر ، ٢٠١٣ ، ل ٨٨ )

بنەمای بەکارهێنانی (( ئیرۆس )) وەك خۆشەویستی جەستەیی یان سێکسی ئەوەیە کە یۆنانییەکان (( ئیرۆس )) خوداوەندی خۆشەویستی و (( دیۆنیسیۆس )) خوداوەندی بادەیان پێکەوە کۆکردەوە ، بۆیە خۆشەویستی و بادە زیادەڕۆییان دەکرد ، هەروەها خۆشەویستییان دەکردە هۆکارێك بۆ چێژوەرگرتن لە خۆشییەکانی خۆشەویستی . ( الاهوانی ، ١٩٥٨ ، ل ٥٥ )

لێرەوە ( ( ئیرۆس )) بویە وشەیەکی سێکسی و ئاماژە بە واتای عیشقێکی قوڵی هەستەکی دەکات ، بەڵگەش ئەوەیە ئەو وشانەی لەم زاراوەیەدا دارێژران لەلایەن دەروونناسەکانەوە بۆ ئاماژەکردن بە واتای سێکسی پەتی بەکاردەهێنرێت . ( ابراهيم ، ( ب ، س ) ، ص ١٣١ )

کاتێك باس لە ( ( ئیرۆس )) دەکەین پێویستە مێژووی دروستبوونەکەشی بزانین لێرەدا سوکرات ئەفسانەیەك دروست دەکات بۆ مێژووی لەدایك بوونی ( ( ئیرۆس )) و بەم شێوە




باســی ئەفســانەکە دەکــات: (( خوداوەنــدەکان ویســتیان بــە بۆنــەی لــەدایك بــوونی ئەفرۆدیتــەوە[١] ئاهــەنگ بگێــڕن ، خــوان [ ولیمــە ] یــەکی گــەورەیان ســازکرد ، یــەکێك لــە ئامادەبووانی ئاهەنگەکە دەوڵەمەندی بوو ، دوای نانخواردنەکە هەژاری ئەو خوانەی بینیـوە و چـووە لەبـەردەم دەرگاکـەدا وەسـتاوە داوای خـوانی کـردووە . دەوڵەمەنـدی بـەهۆی ئـەوەی شەرابێکی زۆری خواردبووەوە ، مەست بووە و چووەتە دەرەوە بۆ ناو باخچەکەی زیـۆس[٢] و بـە قـوڵی خـەوی لـێ کـەوتووە ، کاتێـك هـەژاری چـاوی پێـی کـەوتووە ، بـەهۆی نـەبوونی و برسییەتییەوە ویستوویەتی شتێکی لێ بەدەست بهێنێـت . لێـرەدا هـەژاری لەگـەڵ دوڵەمەنـدی دەخەوێت لە ئەنجامی ئەم جووتبوونەیانـەوە (( ئـیرۆس )) لـەدایك دەبێـت ! لەبـەر ئـەوەی پرۆسـەی سـکپڕبوونی هـەژاری لـە شـەوی لـەدایك بـوونی ئـەفرۆدیت خۆیـدا روویـداوە ، ئـەوا (( ئـیرۆس )) وا دروسـت بـووە جـوانی خۆشـدەوێت ، بۆیـە بووەتـە خزمـەتکار و هـاوڕێی ئـەفرۆدیت ، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی (( ئـیرۆس )) بەرهـەمی جـووت بـوونی دەوڵەمەنـدی و هەژارییــە ، ئــەوا لەدایکییــەوە هژاری و نــەزانی و لاوازی بۆماوەتــەوە و لــە باوکیشــیەوە دەوڵەمەندی و دانایی و ئازایەتی بۆماوەتەوە )) . ( Leon، ١٩٠٨ ، p.٤٨-٥٢ )

(( ئیرۆس)) دوو ئارەزوو پێکەوە گرێ دەدات ، ئارەزووی بینین و تێـڕوانین لـە دوورەوە لەتەك ئارەزووی پەیوەندی کردن ، هاوبەشیکردن لە یەك کاتـدا ، هۆشـیاری عاشـق دەربـارەی ئەوەی کەمەعشوق لە ئێستادا ئیدی کامڵە ، ئەم هۆشیارییە هاوڕێیە لەتەك ئاگادار بوونەوە لەو ڕاستییەی کە ئەو خۆی کامڵ نییە ، یان هوشیاربوونەوە لـە ناکـامڵی خـود ، ئەمـەش دەیخاتـە ژێربۆ ئەوەی (( ئیرۆس )) تووشی داڕمان و گەندەڵی و بۆگەن کردن نەبێت ، پێویست دەکـات هێزی خۆشەویستی خۆی بڕژێنێتە ناو (( مەبەسـتێکی بـاڵاوە )) کـە لـە زانینـی فۆرمیجوانیـدا بەرجەسـتەدەبێت .لەبـەر ئـەم هۆیـە ، ئـەفلاتۆن پێـی وایـە زۆربـەی خـەڵکی بەداخـەوە بەتەرخانکردن خۆیـان بـۆ چـێژ و خۆشـیولەزەتەکانی جـوانی جەسـتەیی ، وزەی ڕاسـتەقینەی خۆشەویســــــــتی بـــــــــــەفیرۆدەدەن . ( بریکهـــــــــــاوس ، ٢٠٠٥ ، ل ٤٤– ٤٥ )

---

١- (ئەفرۆدیت : خودای خۆشەویستی لای یۆنانییەکان و کوڕی زیۆسە )

٢- (زیۆس : باوکی ئەفرۆدیت)

## * خۆشەویستی لە ئاینی مەیسحیدا :

خۆشەویستی لە ئاینی مەسیحیدا گرنگی زۆری هەبووە باشترین نمونە و بەڵگەی جوان لەم بارەوە نامەی (( پۆڵس )) کە ئاڕاستەی (( تورنسۆسەکان )) ی کردووە کە تێیدا هاتووە :

**(( ئەگەر بێت و بە هەموو زمانەکانی جیهان و فریشتەکان بدوێم ، بەلاّم خۆشەویستیتم نەبێ ، ئەوە من وەك گرمەگرمی دەهۆڵ و زیرە زیرەی زوڕنا وام . گەر بێت و بە وشەی خودا بدوێم و هەموو نهێنی و زانیارییەك بزانم و باوەڕێکی تەواوی وام هەبێ بتوانم چیای پێ هەڵکەنم ، بەلاّم خۆشەویستیم نەبێ ، ئەوا هیچ نیم . گەر بێت و هەموو سامانم بەسەر هەژاراندا دابەش بکەم و تا سووتان ژیانم پێشکەش بکەن ، بەلاّم خۆشەویستیم نەبێت ئەوا هیچ سوودی بۆم نابێت . خۆشەویستی دان بە خۆگرتن و ڕۆح سووکییە ، خۆشەویستی لە هەموو شتێکدا هەدادانی هەیە ، باوەڕ بە هەموان دەکات و لە هەموو کاتێکیشدا ئومێدەوارە و بەرگەی هەموو شتێ دەگرێ ، خۆشەویستی هەرگیز ناخەوێ . تۆزە تۆزە زانیاری فێر دەبین و نەختە نەختە بە زمانی یەزدان دەئاخڤین ، بەلاّم کاتێ کەماڵ دەناسین ، ئیدی ناتەواوی نامێنێ . ئێمە ئێستاکە لە ئاوێنەیەکی تەواوی زیاتر هیچی تر نابینین بەلاّم ئەو کاتەی کەماڵ دەناسین ، لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبینەوە . من ئێستا کەمەکێ زانیاریم هەیە ، وەلێ ڕۆژێ پەسلاّنێ بە تەواوی خوداوەند دەناسم ، هەر وەك چۆن ئەویش بە تەواوی من دەناسێت ، جا ئەوەی تا ئەو کاتە دەمێنێتەوە : باوەڕ و هیوا و خۆشەویستییە ، ئەمانە سێ شتن ، بەلاّم خۆشەویستی لە هەموویان مەزنترە . ))** [1]

وەك دەبینین لێرەدا ئەوەی جەختی لەسەر کراوەتەوە ، سێ شتن : (( باوەڕ و هیوا و خۆشەویستی )) ، بەلاّم وەك پۆڵس دەڵێت : (( لە هەموویان مەزنتر خۆشەویستییە ، بەم پێیەش ئاین پێگەی بۆ خۆشەویستی لە پێش چاوگرتووە و ئەوەیش بە پێگەیەکی مەزن لە قەڵەمداوە )). هەر لە گوتەکانی پۆڵسدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە بە نەبوونی خۆشەویستی و ئاوارەبوونی کاتیانەی ئەم وزە نەمرە ، سێ ئاڵۆزی و کەم و کوڕی دەکەونە سیستەمی ژیانەوە:

---

١ئینجیل : ل ٣١٨




**یەکەم / ئاڵۆزی لە زماندا** : بەوەی کە ڕستەکان لە غیابی خۆشەویستیدا دەگۆڕێن بۆ گرمە گرم و زیرە زیر .

**دووەم / ئاڵۆزی لە ئیماندا** : بەوەی کە ئەگەر مرۆڤێك ئیمانێکی ئەوتۆشی هەبێت کە بتوانێ بەهۆیەوە نهێنییەکان بزانێ و چیای پێ هەڵکەنێت ، بەلاَم خۆشەویستی نەبێت ، ئەوە هیچ نییە .

**سێیەم / ئاڵۆزی لە کردەوەدا** : ئەمەش بەوەی مرۆڤ هەرچەندە بیەوێت چاکەکاریش بێت ، بەلاَم خۆشەویستی نەبێت ، ئەوە سوودێکی ئەوتۆی نابێت ، بەم جۆرەش مانای خۆشەویستی لە کردەیەکی سۆزگەرایانەی نێوان دوو مرۆڤەوە دەبێت وزەیەکی (( ئیرۆس )) یانەی نەمر کە مانا بە ژیان دەدات و بگرە ژیانی مرۆڤ لەو ئاڵۆزیانە دەپارێزێت کە هەڕەشە لە بوونی ئینسان دەکەن . ( سیوەیلی ، ٢٠٠٤ ، ١١٥ – ١١٦ )

هەر لە ئینجیلی پیرۆزدا هاتووە لە نامەی پۆڵس کە ئاڕاستەی (( تورنسۆسەکان)) ی کردووە هاتووە: (( **خۆشەویستی توندڕەوی نییە ، داوای بەرژەوەندی تایبەتی خۆی ناکات ، زۆر تورە نابێت ، بەڵکو بۆ ڕاستی دڵشاد دەبێت ، خۆشەویستی هەموو کاتێ بەرگە دەگرێت ، خۆشەویستی هەرگیز نافەوتێ** ..... ))[1]

وە هەروەها قەشە (( فرانسوا دی سال )) لە شوێنێکدا باسی لە خۆشەویستی دەکات و دەیچوێنێت بە هەنار ، لەڕووەوەی ترش و شیرینە ، لە ترشییەکەیدا شیرینی هەیە ، یان لە شیرینییەکەیدا ترشی هەیە ! هەروەها ئەم قەشەیە خۆشەویستی دەبەستێتەوە بە ئازارەوە بۆیە لە شوێنێکی تردا دەڵێت : (( **چێژی خۆشەویستی مرۆڤکوژە و دڵ خۆشی لەو ئازارە بەنرخە وەردەگرێت ، کە تیایدا دەمێنێتەوە تێکی دەشکێنێت** . ))( أبراهيم، ٢٠١٣ ، ل ٢٢٦)

وە هەروەها هەر لەسەر خۆشەویستی قەشە یوحەننا دەڵێت : خوداوەند خۆشەویستییە ئەوەی لەگەڵ خۆشەویستیدا بژی لەگەڵ خوداوەند دەژی ، خوداوەند لەگەڵیەتی ، ئەوەش هەمان بیر و باوەڕی (( دایکە تیریزا )) یە کە لە بەرامبەر یەزداندا هەیەتی چونکە ئەویش پێی وایە خودا خۆشەویستییە ، بەم جۆرە بە شێوەیەکی گشتی لە لای مەسیحییەکانەوە ئەستەمە بتوانین

---

[1] ئینجیل : ل ٣٧٣




خۆشەویستی و خودا لێك جیا بكەینەوە ، هەر لەبەر ئەوەشە پێیان وایە خۆشەویستی خودایە و خوداش خۆشەویستییە . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٤٠ )

## * خۆشەویستی لە ئاینی ئیسلام :

ئاینی ئیسلام بەم واقیعەی ئێستەیەوە بە ئەمەك و ڕەوشت و سنووردانانەكانیەوە دانی ناوە بە دیاردەی خۆشەویستی كە لە گیانی مرۆڤەكانەوە سەر هەڵدەدات ، هەوەرها سێ پلەی خۆشەویستی بۆمان دیاری دەكات ((خۆشەویستی بالآ ، خۆشەویستی ناوەند ، خۆشەویستی نزم)) كە مرۆڤ لە مێژوودا مامەڵەیان لەگەڵ كردووە و لە هەموو سەردەمەكانیشدا هەیە و دەبێت. و لە بنچینەدا ئەم پلانەی خۆشەویستی لەم ئایەتەوە سەری گرتووە :
((قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ))[1]

**خۆشەویستی بالآ** : خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر ( ص) و شەڕكردن لە پێناو خودا ((جیهاد))

**خۆشەویستی ناوەند** : خۆشەویستی دایك و باوك و خوشك و برا و هاوسەر و كەس و كار

**خۆشەویستی نزم** : بەرزكردنەوەی خۆشەویستی بنەماڵە و پارە و موڵك بەسەر خۆشەویستی خودا و پێغەمبەر ( ص) . ( علوان ، ١٩٨١ ، ل ٩ )

ئەگەر بڕوانینە قورئان دەبینین ( ٨٨ ) جار وشەی (( خۆشەویستی )) هاتووە ، لە كۆی هەموویاندا یەك جار وشەی (( خۆشەویستی )) هاتووە كە پەیوەست بێت نێوان (( نێر و مێ )) ئەویش بەسەرهاتی پەیامبەر یوسف ( ع . س ) دایە لە سورەتی یوسف لە ئایەتی ( ٣٠ ) كە دەفەرموێت: (( وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبّاً إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ))[2]

---

١- ( القرآن الكريم ) : سورة التوبة الآية ٢٤

٢- ( القرآن الكريم ): سورة اليوسف الآية ٣٠




واته كۆمەڵێك لـە ژنـە ناودارەكـانی میسـر قاویـان داو وتیـان : سـەیرە ! ژنەكـەی (( عـەزیز )) خەریكی دڵداری و ڕامكردنی غوڵامەكەی خۆیەتی و حەزی لـێ دەكـات ، بـە شـێوەیەك ئـەوین و خۆشەویسـتی چـووەتە نـاو پـەردەی دڵیـەوە و ئـۆقرەی لـێ بڕیـوە ، بەڕاسـتی ئێسـتە لـە سەرگەردانییەكی ئاشكرادا دەیبیستین چوون نـەدەبوو لەگـەڵ خزمـەتكارێكی خـۆی كـارێكی وا بكـات . ئەمـەش ئـەوە دەسـەلمێنێت كـە خۆشەویسـتی هەسـتێكە لـە نـاخی مرۆڤەكاندایـە و ڕاستییە. ( طاهر، ٢٠١٤ ، ل ٣١ — ٣٢ )

خۆشەویستی شتێكە و بوونی هەیە و لە ناخی مرۆڤدا سەرهەڵدەدات . ئیسـلام ڕێگـای پێداوین چێژ لە ژیانمان وەربگرین ، بەڵام بە شـێوەیەكی دروسـت نـە زیـادە ڕۆیـی تێـدا بكـەین نەكەم تەرخەمی . دەبینین پێغەمبەریش (ص) ئینكاری لەم عاتیفەیـە نـەكردووە كـە لـە نـاخی مرۆڤ سەرهەڵدەدات . ئەوەتا كابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبـەر ( ص ) وتـی : ئـەی پێغەمبـەری خودا ، من كچێكی هەتیوم لەلایە ، دوو كەس هاتوونەتە داوای پیـاوێكی دەوڵەمەنـد و پیـاوێكی هەژار ، ئێمە حەز دەكەین بیدەین بە پیاوە دەوڵەمەندەكە بـەڵام خـۆی حـەز دەكـات شـوو بـە فەقیرەكـەـ بكـات. پێغەمبـەریش ( ص) لــە وەڵامــدا فــەرمووی((لَـم نـرَ للمتحـابَّيْن مثل النكاح)).(أبن ماجة ، ١٩٩٨ ، ص ٣٠١)

واتە هیچ چارەیەكی باشتر نابینرێت بۆ خۆشەویستیان جگە لە زەواج .

مانای وایە بیدەن بەوەی كە خۆشی دەوێیت ، لێرەدا كێشەیەكی خۆشەویستی هاتۆتە خزمەت پێغەمبـەر ( ص) ئـەویش هـانی داون لەسـەر زەواج و چارەسـەری كـردوون . ( نـەجار ، ٢٠٠٩، ل٩— ١٠ )

هـەروەها پێغەمبـەر ( ص ) فـەرمانی داوە بـە سـەیركردنی كـوڕ و كـچ بـە مەبەسـتی هێنـانی ، هەروەها دروستە ئیختیاری یەكتر بكـەن و عـەقڵی یـەكتر تـاقی بكەنـەوە ، قسـە لەگـەڵ یـەكتر بكەن ، بچنە بنج و بنەوانی ناسینی یەكترەوە تـا لـە یـەكتر دڵنیـا بـن و بـزانن ئایـا مەسـەلەكە دەستبڕین نییە و ڕاستییە بە مەرجێ لە كاتی هێنانیدا بێت . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٤٥٢ )

هەندێك لە زانایانی ئیسـلام پێیـان وایـە خۆشەویسـتی شـتێكی چاكە لەبـەر ئـەوەی لـە ڕوانگەی هەستێكی خۆنەویسـتییەوە تێـی دەڕوانێـت ، كـەمیش نـین ئەوانـەی لـەو سـەردەمەی پێغەمبەر ( ص) دەژیان تووشی داوی خۆشەویستی بوون وەك خۆشەویستی ((مغیـث)) بـۆ

(( بەریرە )) بەڵام باشترین چارەسەریش بۆ ئەمە وەك پێغەمبەر ( ص) دەفەرموێت : هیچ چارەیەكی باشتر نابینرێت بۆ خۆشەویستان وەك زەواج . بەڵام هەرچی بەشەكەی تریانە ئەوانە چونكە لە ڕوانگەی هەستێكیخۆپەرستانەوە لە خۆشەویستی دەڕوانن بۆیەشە پێیان وایە پەیوەندی خۆشەویستی شتێكی خراپە ، لێرەدا چیرۆكەكەی حەزرەتی یوسف دەكەنە بەڵگە كە تێیدائاماژە بە هەستی خۆپەرستانە دەكات لە ژنەكەی (( عزیز )) ی میسرەوە بۆ خودی یوسف ، كەواتە بە پێی ئەم بەڵگانە خۆشەویستی دوو جۆر هەستی جیاوازن یەكێكیان مرۆڤ بەرەو چاكە دەبات ئەوەی تریان بەرەو خراپە . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٤٣ – ٤٤ )

وەك وتمان خۆشەویستی هەستێكە لە ناخی مرۆڤەكاندایە و بە ویستی خۆت نییە بۆ نمونە پیاوێك لە (( عمر )) ی كوڕی (( ختاب )) ی پرسی ئەی پێشەوای بڕواداران ، ئەگەر ئافرەتێكن بینی و خۆشەویستی ئەو ئافرەتە كەوتە دڵمەوە ئایا گوناهبارم ؟ ئیمامی عمر فەرمووی : ئەیَ خۆ بەدەستی كەس نییە . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ٤٩ )

هەندیَ كەسی نەشارەزا لە ئاینی ئیسلام پێیان وایە كە ئەوەی كەسێكی خۆشویست تاوانبارە و خوای گەورە سزای دەدات بەڵام ئەوەتا زانای ئیسلام (( أبن تیمیە )) دەڵێت : ئەگەر تووشی خۆشەویستی بوو ، حەرامیشی ئەنجام نەدا و ئارامی لەسەر گرت ، ئەو كات خوای گەورە لەسەر ئەو خۆپاراستنە پاداشتی دەداتەوە . ( بن قاسم ، ٢٠٠٤ ، ص ١٣٣ )

وە هەروەها ((أبن القیم ))یش دەڵێت : **خۆشەویستی دروست و ڕیَ پێدراو ئەو خۆشەویستییە كە پیاوێك ئافرەتێكی جوانی بۆ وەسف دەكەن ، یان بەبێ ئەوەی نیەتی خراپ بێت ، لە ناكاو ئافرەتێكی بەر چاو دەكەوێت ، ئەو كات خۆشەویستی دەكەوێتە دڵی ، ئەو خۆشەویستییەش وای لیَ نەكات گوناه و بیَ فەرمانی خوا بكات ، ئەوە لە توانای ئەودا نییە و تاوانبار نییە .**

( نجار ، ٢٠٠١ ، ل ٤٨ )

لە ئاینی ئیسلامدا چەند مەرجێك هەیە بۆ ئەوەی خۆشەویستی نەچێتە قاڵبی گوناه و تاوانەوە

**مەرجەكانیش بریتین لە:**

**١- بینین بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر بێت**

**٢- لە سنووری شەرع دەرنەچوون**




٣- **بەوەفابوون**

٤- **شاردنەوە و باسنەکردنی**

٥- **ڕاستگۆیی**

٦- **ئارامگرتن**

٧- **گوناه نەکردن** ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٤٥١ )

کەواتە بەم بەڵگانە بێت بۆمان دەردەکەوێت لە ئیسلامدا خۆشەویستی ڕێ پێدراوە بەڵام بە شێوەی دروستەکەی وە ناتوانین بە هەموو خۆشەویستییەك بڵێین حەرامە وەك چۆن ناتوانین بە هەموو خۆشەویستییەك بڵێین حەلاڵە هەر بۆیەشە (( أبن القيم )) دەڵێت : **لە ڕاستیدا قسەکردن لەو بارەیەوە واتە : (( خۆشەویستی دەبێت بە وردی بێت و بزانرێت و جیابکرێتەوە ئایا لەو جۆرەیە لە حەرامە یان دروستە ، لەو جۆرەیە کە سوود بەخشە یان زیان بەخش ، چونکە بە ڕاشکاوی ناتوانرێت بڕیار بدرێت کە خۆشەویستی خراپە و دەبێت ڕەت بکرێتەوە ، یان باشە و وەرگیرێت . بەڵکو بڕیارەکەی ئەو کاتە دەدرێت کە حاڵی ئەو کەسە زانرا کە تووشی ئەو حاڵەتە بوو))** . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ٤٦ )

وە هەروەها (( أبن القيم )) دەڵێت : (( **ئێمە پاڵپشتی لەو خۆشەویستییە ناکەین کە بە هۆیەوە خراپەکاری و حەرام و تاوان دروست دەبێت بەڵکو ئێمە باس لە خۆشەویستی پاك و بێگەرد دەکەین کە پیاوێکی بە ئابڕوو توشی دەبێت ، ئاینەکەی و داوێن پاکییەکەی و شەهامەتییەکەی ڕێگەی نادات نێوان خۆی و خودا خراپ بکات و نێوان خۆی و خۆشەویستەکەشی بە حەرام پیس بکات ))** . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ٥٠ )

## خۆشەویستی لای عەرەب :

زمانی عەرەبی فەسیح فراوانترین زمانە بۆ پێناسەکردنی شتەکان ، پاڵاوترین زمانیشە کە حەقی پێناسەکان بدات و ستەمیان لێ نەکات ، چونکە زمانی قورئانە ، لە زمانی عەرەبیدا خۆشەویستی بەم مانایانە هاتووە :




* وتراوە : خۆشەویستی لە بنەڕەتدا بە مانای (( بێگەرد ))ی هاتووە ، چونکە عەرەب بە سپیایەتی ددان دەڵێن : ((**حَبَبُ الأسنان** )) .

* وتراوە : وەرگیراوە لە (( **حُباب** )) کە بلۆقەی ئەو ئاوەیە لە کاتی بارانێکی بەهێز دروست دەبێت ، وەکو ئەوە وایە بڵێی کوڵانی دڵ و تامەزرۆی دڵ بۆ خۆشەویستەکەی بە بلۆقەی ئەو ئاوە دەچێت.

* وتراوە : وەرگیراوە لە (( جێگیر بوون و پەیوەستبوون )) وەك : دەگوترێت ((**أحَبَّ البعير** )) واتە: حوشتر دانیشت و جێگیر بوو و هەڵنەستاوە ، چونکە کەسێك شتێکی خۆشبوێت دڵی پێوەیەوە پەیوەست دەبێ . ( الجوزیە ،( ب. س) ، ص ٢٧ )

* وتراوە وەرگیراوە لە ((**الحُبَّ**)) کە کۆی ((**الحُبَّة**)) یە ئەوەیش بە کاکڵە و بنچینەی شتێك دەگوترێت ، چونکە دڵ بنچینە و کاکڵەی گیانی مرۆڤە ، کە هەر دڵیشە شوێنی خۆشەویستی.(نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٣ )

ئەمە لە ڕووی زمانەوانییەوە بوو بەڵام بۆ مانا فراوانەکەی خۆشەویستی و تێگەیشتن لە خۆشەویستی بۆچوونی زانای عەرەب (( أبن حزم )) باس دەکەین وەك نمونەیەك لە یەکێك لە زاناکانی عەرەب .

## خۆشەویستی لای (( أبن حزم ))

هەرچەندە ئیبن حەزم زیاتر لە گۆشە نیگای ئەدیب و شاعیر و مێژوو نووسەوە باسی خۆشەویستی کردووە ، وەك لەوەی لە گۆشەنیگای فەیلەسوف و شیکەرەوە و توێژەری دەروونییەوە باسی کردبێت ، لەگەڵ ئەمەشدا بە دڵنیاییەوە لە دوو تویێی لێکۆڵینەوەکەیدا لە باری خۆشەویستییەوە زۆرترین تێبینی دەروونی ورد و بۆچوونی فەلسەفی قوڵ دەبینین . (ئیبراهیم ، ٢٠١٣ ، ل ٤٠٥ )

ئیبن حەزم باس لە گەورەیی خۆشەویستی دەکات و دەڵێت : (( واتاکانی خۆشەویستی بە هۆی شکۆمەندییەکەیەوە وردن ،بۆیە وەسف ناکرێن ، تەنیا لە ڕێگای ئازارەوە مرۆڤ لە حەقیقەتەکەی تێدەگات ، نە ئاین و نە لە شەریعەتدا بە خراپ دانەنراوە چونکە دڵەکان بەدەست خوای گەورەن)). ( أبن حزم ، ١٩٦٤ ، ص ١٥٣ )





ئیبن حەزم خۆشەویستی دەبەستێتەوە بە عاشقەوە لە گۆشەنیگای ئەوەوە ، نەك لە گۆشە نیگای مەعشوقەوە ، لەو ناونیشانەکان و دیاردە و نەهامەتییەکانی خۆشەویستی دەدوێت ، تەنانەت ئیبن حەزم کاتێك باسی وەفا دەکات ، دەیبەستێتەوە بە عاشقەوە نەك مەعشوقەوە ، چونکە عاشق لە خۆشەویستییەکەیدا دەستپێشخەری کردوە و وەفا لەسەر ئەو پێویستە ، بەلاَم مەعشوق لە قبولَکردنی یاخود ڕەتکردنەوەی سەرپشکە ! لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان عاشق و مەعشوق وەك جیاوازی نێوان موگناتیس و ئەو پارچە ئاسنەیە.

(ئیبراهیم ، ٢٠١٣ ، ل٤١٠ — ٤١١ )

لێرەدا ئیبن حەزم لەگەڵ نووسەری فەرەنسی (( ستاندال )) دا یەك دەگرێتەوە کە پاش ئیبن حەزم وتوویەتی لە خۆشەویستیدا پیاو هێرشبەرە و ئافرەتیش بەرگریکارە ، پیاو داواکەرە ، ئافرەتیش ڕەتکەرەوەیە ، پیاو گیانبازێکی ئازایە ، ئافرەت شپرزە و ترساوە .

( Mourois، ١٩٤٢ ،p.١٠٠ )

ئیبن حەزم باسی نیشانەکانی خۆشەویستی دەکات ، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە چاو دەرگای نەفسە (( نهێنییەکانی دەروون دەردەخات ، گوزارشت لە شتە شاراوەکان و ناوەکییەکانی ناو نەفس دەکات )) بۆیە سەیر نییە (( نیگا )) خالّیدەستپێکی خۆشەویستییە.

( ئیبراهیم ، ٢٠١٣ ، ل ٤١٢ )

ئیبن حەزم لەسەر یەکەم نیگا بەردەوام دەبێت و دەلّێت : من زۆر سەرم سوڕ دەمێنێت لەو کەسەی لای لێ دەدات لە یەك نیگاوە عاشق دەبێت ، بڕوای پێناکەم و خۆشەویستییەکەی بە جۆرێك لە ئارەزوو (( الشهوە )) دادەنێم . بەلاَم بە بڕوای من ئەوەی لە قولّی دلّەوە دەچەسپێت ، دەچێتە پەڕەکانی دلّەوە ، ئەمە زۆر بەهێزە ، هیچ خۆشەویستییەك لە هەناوی مندا سەریهەلّنەداوە دوای زەمەنێکی درێژ نەبێت ، دوای ئەوەی کەسەکە تەمەنێك لەگەلّدا بووە و لە زۆر شتی جدی و گالّتەدا پێکەوە بووین ، هەروەها لە کاتی لەبیرچوونەوە و تامەزرۆییمدا هەرگیز هیچ خۆشەویستییەکم لەبیر نەکردووە . ( ابن حزم ، ١٩٦٤ ، ص ٢٥ )

ئیبن حەزم مەبەستی ئەوەیە کە (( یەکەم نیگا )) خالّی دەستپێکی خۆشەویستییە نەك لە یەکەم نیگاوە عاشق بوون ڕوودەدات بەلّکو لە یەکەم نیگاوە دەستپێدەکات .




ئەمجارە ئیبن حەزم باس لەوە دەکات کە چۆن مرۆڤ عاشقی کەسێك دەبێت کە (( هەرگیز نەیبینیوە و دروست نەکراوە و لە دونیادا نییە )) ! ئەم جۆرە خۆشەویستییەمان بۆ شی دەکاتەوە و دەڵێت : ئەو کەسەی زەینی خۆی لەسەر خۆشەویستی کەسێکدا بەتاڵدەکاتەوە ، کە نەیبینیوە ، کاتێك لەگەڵ هزری خۆیدایە بە وەهم وێنەیەك بۆ ئەو کەسە دروست دەکات ، چاوێکیشی بۆ دروست دەکات و بەرامبەر ویژدانی خۆی دایدەنێت . بگە لەو کەسی تری لە خەیاڵدا نییە و خەیاڵدا نییە و خەیاڵی بەرەو کەسی تر ناچێ. (أبن حزم ، ١٩٦٤ ، ل٢٠-٢١)

**ئیبن حەزم ئاماژە بەوە دەکات خۆشەویستی پێنج ڕۆڵ یاخود پێنج پلەی هەیە :**

١- **بە جوانترین** : بە جوانترینیش ئەوەیە سەیرکەر وێنەی سەیرکراو دێنێتە پێش چاوی خۆی و بە جوانی دەزانێت ، یان ڕەوشتەکەی بە جوان دەزانێت ، ئەم پلەیە زیاتر دەچێتە بەشی هاورێیەتیەوە نەوەك بەشی خۆشەویستی .

٢- **سەرسام بووم** : سەیرکەر ئارەزووی سەیرکراو دەکات و حەز دەکات لێی نزیك ببێتەوە .

٣- **هۆگر بوون** : ئەمەش بیرکردنی مەعشوقە کاتێك دیار نەبوو .

٤- **خۆشەویستی زۆر** : ئەمەش ئەوەیە خەیاڵ بەردەوام پێوەی خەریك دەبێت ، یان ئەوەیە کە لە دڵداری بە (( عیشق )) ناودەبرێت .

٥- **خۆشەویستی لە ڕادەبەدەر** : ئەمەش بریتییە لەوەی کەسەکە نووستن و خواردن و خواردنەوەی کەمدەبێتەوە ، لەوانەیە خۆشەویستی لە ڕادەبەدەر ببێتە هۆی نەخۆشی یان ببێتە هۆی وەسواسی یان ببێتە هۆی مردن . ( ابن حزم ، ١٩٦٢ ، ص ٤٧ )

## * خۆشەویستی لە ئەوروپا :

لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (( Love)) وشەیەکی سارد و سڕە کە تەنها بۆ پەیوەندی نێوان نێر و مێ بەکاردەهێنرێ و کە کەسێ بە بەرامبەرەکەی دەڵێ یان لە باسی کچێکدا دەڵێ(( I Love You )) ئەوە بانگێشتی دەکات بۆ مومارەسەی سێکسی ، بەڵام ئەگەر




باسی خۆشەویستی نیشتمان یان هەر شتێکی تر بکات دەڵێت (( Like )) بۆ نمونە (( I Like my work)) . ( بندق ، ٢٠١٠ ، ص ٤٣ )

وەك دەبینین چەندین زانا و شاعیر و ڕۆماننوس و .... لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا هەبوون و هەن کە خۆشەویستیان بەستووە بە سێکسەوە ، وەك شاعیری گەورەی ڕۆمانی (( Ovid )) لە کتێبەکەیدا بە ناوی هونەری خۆشەویستی ((Ars Amatoria)) خۆشەویستی بە ڕاستی خۆیی بەستووە بە سێکسەوە لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا .( بندق ، ٢٠١٠ ، ل ٤٠ )

وە هەروەها زانای گەورەی دەروونناسی فرۆیدیش بە هەمان شێوە دەڵێت : خۆشەویستی هەستێکی چەپێنراوە لە نائاگاییدا کە لە ژێر کاریگەری غەریزەیەکی سێکسیدایە ، وە ئامانجی گەیشتنە بە کرداری جووت بوونی سێکسی وە پێی وایە هەموو ئامانەکان لە هەر جۆرە خۆشەویستییەك بن تەنها جووت بوونی سێکسییە . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٣٥ – ٣٦ )

(( روبین و بلوتشك و کونتی و هاتفیلد )) و چەند زانایەکی تریش ویستیان ئەم دوو دەستەواژەیە واتە (( Love،Like )) لە یەك جیا بکەنەوە ، بەڵام دوای هەوڵێکی زۆر هیچیان پێ نەکرا ، تاوەکو ئێستاش هەرماوە ، بۆیە دەبینین لە ئەوروپا خۆشەویستییەوە خەڵکی بە ڕووتی بەسەر شەقامەکاندا کاری بەدڕەوشتی دەکەن ، وشەی خۆشەویستیشیان پیس کردووە. ( بندق ، ٢٠١٠ ، ص ٣٨ – ٣٩ )

خۆشەویستی پانتاییەکی زۆری داگیر کردووە لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا ، تەنها لە نێوان ڕەگەزی نێر و مێ نەوەستاوە بەڵکو پەلی کێشاوە بۆ ناو هەموو بابەتەکانی ژیان ، کۆمەڵێ هۆکاری یاریدەدەر هەن کە بوونەتە هۆی بڵاوبوونەوەی بەم شێوە گەورەیە هەتا وای لێ هاتووە ئێستا خۆشەویستی بووە بە بازرگانییەك کە ملیارەها دۆلاری لێ پەیدا دەکرێت و کۆمەڵێ ورووژێنەری دەرەکی هەیە کە یارمەتی دەرن لەم بوارەدا وەك جل و بەرگ و فاشیۆن و ڕۆژنامەی سێکسی و ئەو فیلمانەی کە بەها و دای و نەریتەکانیان فەوتاندووە و گرفتی لەبەردەم گەنجان دروست کردووە لە هاوسەرگیری کردن و بووەتە هۆی دروستکردنی بۆشایی فیکری و عەقڵی و خێزانی بێ بەها کردووە . دکتۆرێکی بەریتانی کە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی دەروونییە لە لەندەن تێبینی ئەمەی کردووە و دەڵێت : پێ دەچێت سەیرترین بازرگانی کە هەزارەها ملیۆن پێ دەستدەکەوێت بازرگانی خۆشەویستییە و دروستکردنی فیلم و




ئەمانەیە.... یارمەتی دەربوون لە پووچکردنی سۆزی ئەم جیلە کە دوای جەنگ لە دایك بوون و هاتوونەتــە دونیــاوە و پێیــان وایــە کــە خۆشەویســتی جــوانی و جادووگەرییــە ... وشــەی خۆشەویستی بووە بە وێنەیەکی خەیاڵی کە مرۆڤ ناتوانیٚ پێی بگات بۆیە ناتوانێت مومارەسـەی خۆشەویستی بکات و بگاتە ڕەزامەندی سۆزداری کە ئەمەش تووشـی شـۆکی دەروونـی دەکـات چونکە خەیاڵەکانی خۆی دوورن لە ڕاستییەوە . ( عابد ، باعوق ، ٢٠١٠ ، ص ٢٠ — ٢١ )

ڕۆژئاوا بە گشتی و ئەورووپا بە تایبەتی کاتێك باس لە خۆشەویستی نێوان (( نێر و میٚ )) دەکەن مەبەستیان هەوەس بـازی و ڕابـواردنی جنسـییە نـەك سـۆز و عاتیفـە ، ئـەوان سـۆز و عاتیفەیان تێکـەڵ کـردووە بـە حـەز و ئـارەزووات ، ئەگـەر باسـی خۆشەویستیشـیان کـرد واتـە ئەنجامدانی بەدڕەوشتی و کاری جنسی . ( نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥ )

## * خۆشەویستی لای کورد :

وەك لە دیاری کردنی زاراوەکاندا ئاماژەمان پێدا لە زمانی کوردیـدا وشـەی خۆشەویسـتی بە مانای حەزلێکردنی بوونەوەرێکی زیندوو بۆ بوونەوەرێکی زیندووی تر بەکار دێت ، بۆ نمونـە خۆشەویستی مرۆڤ بۆ دایك و باوك ، منداڵ ، یان هاوسەر ، هەروەها خۆشەویستی کوڕ بۆ کچ و یـان بـە پێچـەوانەوە بـەڵام حـەزی بوونـەوەرێکی زینـدوو بـۆ شـتێکی بـیٚ گیـان پێـی ناوترێـت خۆشەویستی بەڵکو هەر بە حەزلێکردن و حەزلێبوون ناودەبرێت .( خورشید،٢٠١٣،ل٢٨)

کۆمەڵگای کـوردی بـەهۆی پەیوەسـتبوونی ڕۆحانـەی بـە کلتـووری ئـاینی و خێڵـەکانی بـەردەوام لـە ژێـر کاریگـەری ئـەو دوو پێکهاتەیـەدا بـووە ، بۆیـە پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی و سـۆزداریەکانیش بـە پێـی ئـەو کلتـورە ئـەنجام داوە ، بـە مانایـەکی تـر ژیـانی هەسـتەوەری و خۆشەویســتی لــە کۆمــەڵی کوردیــدا ، وەك کۆمــەڵگاکانی تــری هــەڵگری کلتــوری خێــڵ مومارەسـەکردنی گونـاه و حـەرام بـووە ، تـاکی کـوردی بـە درێـژایی مێـژووی مێـژووی خـۆی نـەیتوانیوە بـە ئازادانـە مومارەسـەی خۆشەویسـتی و ژیـانی هاوسـەری بکـات و هـەر تاکێـك سەرپێچی فەرمانەکانی ئایین و خێڵەکانی کردبێـت دوو چـاری سـزای توونـد بـووە . ( کـەریم ، ٢٠٠٥ ، ل ١٠١ )




كە ئەمەش بەهۆی هەڵتێکەیشتنەوە بووە لە ئایین چونکە لە برگەی خۆشەویستی لە ئاینی ئیسلامدا بە چەندین بەلگەوە ئەوەمان سەلماند کە خۆشەویستی قەدەغە نییە و رێگە پێدراوە بە پێی ئەو مەرجانەی کە لە ئایندا دانراون .

ئەم پەیوەندییە لە کۆمەڵگایەکی وەك ئەوەی ئێمە پیاو سالاریدا هەمیشە پەیوەندییەك بووە کە تیایدا بکەر نێرینە بووە و بابەتی پەیوەندییەکەش مێینە بووە ، ئەمەش بە مانای ئەوەیە ، ئەوەی لە کۆمەڵگای ئێمەدا خۆشەویستی دەکات و رێگەی پێدراوە هەستەکانی خۆی دەربڕێت نێرینەیە و ئەوەش کە پەیوەستە بابەتێ لە بەردەم هەست و حەزەکانی نێرینەدا مێنەیەکی پاسیڤەکە فێرکراوە نابێت لە باسکردنی ژیانی هەستەوەری خۆیدا نەرم و شل و راشکاو بێت . هەڵبەت ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نییە لە کۆمەڵگای ئێمەدا مێینە وەك نێرینە خۆشەویستی ناکات و نەیکردووە ، بەڵکو تەنها ئاماژەدانە بەو راستییەی کە پێمان دەڵێت ژیانی هەستەوەری لەم کۆمەڵگایەدا ژیانێکی لە چوارچێوە گیراوە و دەسەڵاتی پیاوسالاری بە جۆرێ پێناسەی کردووە کە تیایدا بەرژەوەندییەکانی نێر پارێزراوبن . ( سیوەیلی ،٢٠٠٤،ل ١٦٥ )

ژیانی هەستەوەری و خۆشەویستی ، لە کۆمەڵگای کوردیدا بەو شێوەیە گوزەری کردووە و بەشی ژنانیش توند و تیژی و ئازار بووە لە دەست ئەو کلتورە و ئەو رەوتە ، بە هەموو ئازارەکانییەوە وە درێژەی کێشاوە ، دەتوانین بڵێین تا ئێستاش کە دونیا یەك گۆڕانکاری گەورە لە ژیانی کۆمەڵگاری مرۆڤایەتی و پەیوەندییەکانیدا رووی داوە ، بەلآم لە کۆمەڵگای کوردی دا مەسەلەی کوشتن لە سەدەی بیست و یەك دا بوونی ماوە و جێبەجێ دەکرێ و ئێستاش رەخنەگرتن لەسەر کلتووری خێڵەکانی بۆ رۆشنبیر و نووسەری کورد زۆر زەحمەتە . ( کەریم ، ٢٠٠٥ ، ل ١٠٥ )

لەوانەیە هیچ کۆمەڵگایەك هێندەی کۆمەڵگای کوردی ، لە خۆشەویستی نەترسێ و دژی نەوەستێتەوە ، چونکە عەقڵیەتی پیاوسالاری لەسەر ئەو کلتوورە راهاتووە ، کە هەموو شتێك لە هێزدا ببینێتەوە و کار بۆ ئەوە دەکات بەردەوام بەهۆی هێزەوە زاڵ بێت بەسەر بەرامبەر و هەموو شتەکانی تردا .لەگەڵ ئەوەی خۆشەویستی هەستێکی ئینسانییە و پێویستی بە هێز نییە و پەیوەندییە کە لەسەر بنەمای یەکسانی نێوان (( ژن – پیاو )) دروست دەبێت و هەموو هێزی دونیا ناتوانێت خۆشەویستی دروست بکات . بۆیە پیاوی کۆمەڵگای کوردی ، هەمیشە




دیوارێکی له نێوان خۆی و خۆشەویستیدا دروست کردووە و ترساوە و زۆر به کەمی نوانیویەتی ئەو هەستەی هەیەتی بەرامبەر بە ڕەگەزی مێ دەری ببڕێت و لە قوڵایی دڵتەوە و هەمیشە خۆی لە حاڵەتی وەسفکردندا دەبینێ ، ڕوانین پیاوی کۆمەڵگای کوردی بۆ مەسەلەی خۆشەویستی گرفتێکی گەورەی له سایکۆلۆژیەتی دا دروست کردووە و خۆشەویستی لە لای ئەفسونێکی زۆر گەورەیە و بەردەوام سڵی لێ دەکاتەوە . ( کەریم ، ٢٠٠٥ ، ل ١١٢ – ١١٣ )

## * تیۆرەکانی خۆشەویستی :

### یەکەم : فسیۆلۆژی :

ئەم بیردۆزە خۆشەویستی لە ڕوانگەی ڕەفتارێکی دەرەکییەوە بەدی دەکات بەوەی گۆڕأنکاری کیمیاوین و له ناو جەستەدا ڕوودەدات ، ئەم بیردۆزە جەخت لەوە دەکاتەوە کە خۆشەویستی له جەستەی مرۆڤەکاندا وەڵامدانەوەیە بۆ دوو مەسەلە ئەوانیش : گۆڕانکارییە هۆرمۆنییەکانە یان بوونی مادەی (( الابنفرین )) کە لە جەستەی مرۆڤدا ڕوو لە زیادبوون دەکات کاتێك به شتێك یان به مرۆڤێك سەرسام دەبێت ، گرژ بوون لە دەمارەکانی ڕوودەدات و ترپەکانی دڵی زیاد بکات ، جگە له خێرایی هەناسەدان و سوور بوونەوەی پێستی بە تایبەت دەم و چاوی . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٠١ )

ئەگەر بیر و ڕای زانایانی فسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا له بارەی ئەوەوە وەرگرین که جێگەی خۆشەویستی له ناو جەستەدا دەکەوێتە کوێوە چەندین بۆچوونی جیاوازنان دەستدەکەوێت ، چونکه ماوەی سی ساڵه هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی دەستنیشانی شوێنەکەی بکەن ، هەندێ لە زانایان پێیان وایه کۆمەڵێك خانه له مێشکدا هەن پێیان دەوترێت (( سینابس )) واته [ بنکەی هەستەوەیە سۆزیەکان ] دەکەوێته بەشی دواوەی مێشك که پێی دەڵێن (( چاڵی ژێر چاو )) لە ژێر (( هایپوپلاموس )) هەندێکی تر بڕوایان وایە ئەو بنکانەی کە بەرپرسیارن لە سۆز و خۆشەویستی بریتییه له (( سی و پێنج )) شوێنی ئاڵۆز لە مێشك کە بە (( سی و پێنج )) گورزە هەستیارەکان بەستراون وە ئەمەش بە هەموو لەشدا بڵاو بوونەتەوە ، ئەو تۆڕە هەستیارە پێی دەوترێت (( أمب – سیستەم )) بەڵام هەرچی (( لیبوتیز )) ە کاتێك باسی




گرنگی پەردە پۆشی جومجومەی ناوەوەی مێشك دەكات لە بەشی خوارەوە بە شێوەیەكی پێچاوپێچ هەڵگری ڕژێنێكە ، ئەنزیمێك دەردەدات كە دەورێكی سەرەكی هەیە بۆ كراوەی و ڕووخۆشی و زەردەخەنەی مرۆڤ ، وە هەروەها تۆڕێكی هەستەوەرەكان دەوری ئەو ڕژێنەیان داوە ئەنزیمی (( ئەندرۆفین )) دەردەدات كە بەرپرسیارە لە خۆشی و ناخۆشی لە كاتی خۆشەویستیدا ، وە جگە لەمانەش بەم دواییانە كۆمەڵێك زانا هەستان بە دەستنیشانكردنی هۆرمۆنی ((NGF)) لە مێشك دا ، پێیان وایە ئەو هۆرمۆنە ڕۆڵێكی سەرەكی هەیە لە گەشەكردن و مانەوەی دەمارەخانە بەرپرسەكان لە هەست و سۆز بەرامبەر بە كەسانی دیكە . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٦٤ – ٦٥ )

## دووەم : شیكاری دەروونی ( فرۆید )

فرۆید عەقڵ و كەسێتی دابەش دەكات بە سێ بەشەوە : هەست ، پێش هەست ، نەست ، نەست كۆگای هەموو ئەو پاڵنەرە سەرەكیانەیە كە فرۆید پێی باشە بە نەست ناوزەندی بكات برسێتی ، تینویەتی ، سێكس ، یان وزەی سێكس (( لبیدو )) بەڵام لە دوای دەست پێدا هێنانەوەی تیۆرەكەی غەریزە دابەشی دوو پۆلی سەرەكی دەكات ئەویش [( ( ئیرۆس )) ((ڕەمەكی ژیان ))، ساناتۆس(( ڕەمەكی مردن )) ]. ( سالح ، ٢٠٠٢ ، ل ٥٣ )

(( ڕەمەكی ژیان ، لە پاڵنەرە سێكسییەكان خۆی دەدۆزێتەوە )) و (( ڕەمەكی مردن خۆی لە پاڵنەری شەڕانگێزی خۆی دەدۆزێتەوە )) ، فرۆید پێی وایە ئەم دوو پاڵنەرە بەردەوام لە ململانێدان و بە چەند شێواز خۆیان دەخەنە ڕوو ، بۆ نمونە ڕەمەكی ژیان لە حاڵەتی نەخۆشی دەروونی ، وەك خۆشەویستی بۆ خود خۆی نیشان دەدات ، پاشان دەگۆڕێت بۆ كەسانی دەرەوەی خۆی ، لە سەرەتاكانیدا لە گرێی دەروونییەكان خۆی دەدۆزێتەوە وەك (( گرێی ئۆدیب)) كە لەوێوە كوڕەكە خۆشەویستییەكەی ئاڕاستەی دایكی دەكات و باوكی وەك ڕكابەرێك سەیر دەكات لە خۆشەویستییەكەی بۆ دایكی . ( عزیز ، ٢٠١١ ، ل ١٨٩ )

بیردۆزی فرۆید لە خۆشەویستیدا پێی وایە هەموو ڕەفتارێكی دەروونی ئاسایی و نەخۆشی ڕەنگدانەوەی غەریزەكانمانە ، بەو واتایەی لە بنەڕەتەوە غەریزەكان بوونیان لە مرۆڤەكاندا هەیە ، ئەوانیش دەبنە هۆی خولقێنەری ڕەفتارە هەستەكانی دیكەمان ، نمونەی




ئەوانـەش خۆشەویسـتییە کـە سـەرەتای ئـەو هەسـتکردنە بـە خۆشەویسـتی لـە لای مـرۆڤ لـە پەیوەندی منداڵ بە دایکییەوە دروست دەبێت . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٠٠ )

فرۆید پێی وایە ئەو هەستە چەپێنراوە لە نائاگاییدا کە لە ژێر کاریگـەری غەریزەیـەکی سێکسیدایە ، وە ئامانجیشی گەیشتنە بە کرداری جووت بوونی سێکسی . فرۆید تەنها باسی لە خۆشەویسـتی سێکسـی دەکـات و جۆرەکـانی تـری پـەراوێز خسـتووەو وە هـەروەها پێـی وایـە هەموو ئامانجەکان لە هەر جۆرە خۆشەویسـتییەکدا تـەنها جـووت بوونـە . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٣٥ – ٣٦ )

هەروەها فرۆید باس لە خۆشەویستی نێوان ژن و مێردیش دەکـات و دەڵێـت خۆشەویسـتی لـە نێوان ژن و مێردیش ڕەنگدانەوەی وزە سێکسییەکانەوە بۆ بابەتە جیاوازەکـان پەیـدا دەبێـت ، چونکە خۆشەویستییەکە لە ڕووخساری دەرەوەدا ئەگەر خۆشەویستییەکی ئاسمانییـە ئـەوا لـە ناوەوەدا لەسەر بنەمای خۆشەویتییەکی زەمینییەوەیە ، بۆیە جـۆری پەیوەندییەکـەش لەسـەر چـۆنییەتی مومارەسـەی سێکسـییەوە ڕاوەسـتاوە ، لەبـەر ئەوەیـە هـەر کـەم و کورتییـەك لـە سێکسی هەریەکەیان مانای پەیدابوونی کـەم و کورییـە لـە تـەواوی پەیوەنـدی نێـوان ئـەو ژن و مێردانەدا ، لە واقیعەدا بەڵگە زۆرە ،بۆ نمونـە چـەند ئـافرەت هەیـە ئـەو کاتـەی منـداڵی نابێـت ڕێزێکی ئەوتۆی نامێنی لە لای پیاوەکەی ، بۆیەش (( فرۆید )) بەڵگە دێنێتەوە بـۆ سـەلماندنی تیۆرەکەی ئەویش ئاماژەدانە بە ((بابەتە جیاوازەکان )) ، ئینجـا ئەشـێ مەبەسـتی لـەو بابەتـە جیاوازانە  تەنها مەسەلەیەکی سێکسی ڕووت بێ واتە (( تـەنها پێکـەوە نووسـانی ئەندامـەکانی زاوزێ بێــت )) یـان ((تــەنها فـۆرمی جەسـتەیی)) بێـت ئـەویش بـەو مانایـەی ئـەو ئەندامانـە دەگرێتـەوە کـە لـە جەسـتەدا ووروژێنـەرن یـاخود (( ئـەو شـتە مادیانـە )) بێـت کـە تـەواوی ((تموحەکانی )) مرۆڤ لە خۆ دەگرێت . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٢٠٦ – ٢٠٧ )

هەر بۆیە فرۆید وای داناوی کە خۆشەویستی تەنها دیاردەیەکی سێکسی پەتییـە و دەرەنجـامی پشێویەکی کیمیاییە ، کە لە جەستەدا ڕوودەدات و پێویستی بە جۆرێك لە خـاڵی بوونـەوە یـان خستنەگەڕی وزەکەیەتی بۆ نەهێشتنی ئەو ئازارەی لە ئەنجامی ئەم پشـێویەوە سـەرهەڵدەدات لە تێڕوانینی فرۆیددا خۆشەویستی تەنیا ئارەزوویەکی سێکسییە ، ئارەزووی سێکسـیش بـەلای ئەوەوە پێویستییەکی ئۆرگانی وەك تینویەتی و برسێتییە و پێویستی بە بابەتێکی سێکسییە




کار لەسەر نەمانی یاخود کەمکردنەوەی بکات واتە تەنیا وروژانێکی ناوەکییە و بەهۆی تێربوونی سێکسییەو نامێنێت . ( ئیبراهیم ، ٢٠١٣ ، ل ٣٩ – ٤٠ )

## سێیەم : سێگۆشەی خۆشەویستی ( سترنبرگ )

ئەم تیۆرە بە سێگۆشەی خۆشەویستی ناسراوە ، خۆشەویستی دەکات بە سێ بەشەوە (( سۆزداری )) و (( حەز )) و (( پابەند بوون )) ، خۆشەویستی ڕاستی کاتێک ڕوودەدات کە سەرەتا هەرسێ بەشەکەی تێدا بێت وە لە نێوانیان یەکسانییەکی تێدابێت . هەر کاتێك یەکێك لەمانە هەبێت یان دووان پێکەوە لە ئەنجامدا ئەو خۆشەویستییە تەواو نابێت و کەم و کورتی تێدایە .( Sternberg، ١٩٨٦، p.١١٩ )

سەرەتا پێویستە هەر یەك لەم سێ بەشەی خۆشەویستی باس بکەین :

١- **سۆزداری**: واتە نزیکی لە پەیوەندیدا ، کە ئەمە لە نێوان پەیوەندی هاوسەریدا هەیە بەڵام کەسانی تر لێی بێ ئاگان ، سۆزداری واتە هێنییەکان و ئەزموونەکانی تاکەکەس و هاوبەش ، هەستی ئارامی لە پاڵ یار و ئارامی گۆڕینەوەی بۆچوونەکانیان سەبارەت بە یەکتر ، سۆزداری وەك پێویستییەك بۆ نزیك بوونەوە لە کەسێکی تر پێناسە کراوە . سۆزداری بە هێواشی دەگۆڕێت و پلە بە پلە بە ڕووی پایەیەکی پەیوەندیدا دەڕوات . بەم پێیە هەندێ جار بە هۆی گۆڕینی بواری ژیان نێوان هاوسەرگیری لەوانەیە ئەم سۆزدارییە کەم بکات بۆ نمونە لە دایك بوونی منداڵ یان فشاری باری ئابووری .

٢- **حەز**: مەبەست لەم پەیوەندییە لە ناوەکەیدا دیارە و بە بۆچوونی دەروونناسان وزە بەخشی نێوان پەیوەندی هاوسەرییە ، ئەم شەیدابوونە لە یەك پەیوەندی تەندروست زیاترە لە ئارەزوویەکی سێکسی . سەرنجڕاکێشانی سێکسی بزوێنەرێکی دەروونی بەهێزە کە ( بەم شێوەیە) پێناسەی دەکرێت : (( نزیکبوونەوەیەکی نا ئاساییە لە کەسێکی دیاریکراو و بەسەرنجڕاکێشانی فیزیایی بەبێ توانای بەرگری و حەزێکی خۆشەویستی جەستەیی ، سەرنجڕاکێشان لە سەرەتای پەیوەندییەکی بەهێزدایە و بە خێرایی دەڕوات وەك عادەتێکی لێ دێت)) .




٣- **پابەندبوون** : پابەندبوون بە واتای بەرپرسیارییەتی و وەفاداری و بەڵێن بردنە سەرە واتا تا چی رادەیەك دەتوانیت ئەم پەیوەندییەتان بە باشی و شادی بپارێزیت ، پابەندبوون واتە باوەڕکردن بەوەی کە زۆربەی کێشەکان دەتوانرێت بە هاوکاری یەکتر چارەسەر بکرێت و تێپەڕێنرێت ،پابەندبوون واتە ناسینی کەسێك لەلایەن کەسێکی ترەوە کە هەستی راستگۆیی و متمانەی پێ هەیە . ئەگەر بچینە نێو پابەندبوون بە کەسێکەوە هەوڵ دەدەین هەر هەنگاوێکمان بۆ ئەوە بنێین کە ئەم پەیوەندییە بەهێز بکەین . پابەندبوونی کورت ماوە واتە بڕیاردان بۆ خۆشەویستی کەسێك و پابەندبوونی ماوە درێژ واتە بڕیاردان بۆ مانەوە و کارکردن لەسەر ئەم پەیوەندییە . پابەندبوون لە نێوان دوو کەسی خۆشەویستدا لەسەرەتای پەیوەندی کەم کەم زیاد دەکات و پاشان پلە پلە بەهێزتر و زیاتر دەبێت. ( Lamy، ٢٠٠٩ ، p.١٧ ) ئەگەر بێت و یەکێك لەو بەشانەی باسمان کرد لە خۆشەویستیدا هەبێت ئەوا ( بەم شێوەیە ) دەبێت :

١- **سۆزداری بە تەنها**/ لەم جۆرە پەیوەندییەدا پابەندبوون و هەستی سێکس بوونی نییە و پەیوەندی لەسەر بنەمای میهر و هاوڕێیەتی لە نێوان دوو کەسدایە ، ئەم جۆرە پەیوەندییە لە نێوان ژن و مێرددا هیچ مانایەکی نببە ، ئەم جۆرە پەیوەندییە سترنبرگ ناوی نا ((خۆشەویستی هاوڕێیانە )) کە لە نێوان دوو هاوڕێ ڕوودەدات . کە لە دەرەوەی بازنەی باسەکەی ئێمەوەیە.

٢- **تەنها حەز**/ ئەم پەیوەندییە بە (( خۆشەویستی سەودایی )) ناودەبرێت و پەیوەندییەکی بێ بنەما و پوچە و بە خێرایی لە ناو دەبرێت و هەندێ جار بەم جۆرە دەوترێت خۆشەویستی لە یەکەم نیگاوە .

٣- **تەنها پابەندبوون**/ سترنبرگ ئەم پەیوەندییە بە (( خۆشەویستی بەتاڵ )) ناودەبات لەم جۆرە خۆشەویستییە ، ژن یان پیاو پەیوەندییان بە یەکترەوە نییە و تەنها بەهۆی هەست بە بەرپرسیارییەتی کە هەیانە یان بەهۆی منداڵەکانیانەوە کە هەست بە بەرپرسیارییەتی دەکەن لەم پەیوەندییە بەردەوامن بەڵام سەبارەت بە یەکتر سارد و بێ هەستن . خۆشەویستی بەتاڵ لە تەنها پابەندبوونی تێدایە.( مجد ، مجد ،٢٠١١ ، ص ٨٣ – ٨٤ )




به گشتی خۆشەویستی بەتاڵ لە دوو حاڵەتدا ڕوودەدات :

**یەکەم : هاوسەرگیرییەك کە بەبێ هەڵبژاردنی یەکتر بووبێت و بێ ویستی خۆیان هاوسەرگیرییان کردبێت .**

**دووەم : ئەو هاوسەرانەی کە ساڵانێکی زۆر پێکەوە ژیاون ئیتر پەیوەندییەکی ڕاستیان لەگەڵ یەکتر نەماوە و ئەمە تەنها وەك نەریتێکە کە لە ژیاندا هەیە . لە ڕاستیدا ژن و مێرد لەم حاڵەتەدا تەلاقی سۆزداری دراون لە لایەن یەکترەوە .**(Sternberg،١٩٩٨،p.٩٣-٩٤ )

٤- **پابەندبوون + سۆزداری**/ ئەم پەیوەندییە ناودەبرێت بە (( خۆشەویستی دڵسۆزانە )) لەم جۆرە پەیوەندییەدا حەز و ئارەزوو بوونی نییە بە بۆچوونی سترنبرگ ئەم پەیوەندییە مەترسی هەرەس هێنانی نییە و ژن و پیاو بە خۆشەویستییەوە بەرپرسیاریەتی بە ژیانی خۆیان بەردەوامن هەرچەندەش بەرامبەر بە یەك هەستی سێکسیان نییە ، بە گشتی ئەم جۆرە پەیوەندیانە لە نێوان ئەو هاوسەرە لاوانەن کە دوای ژیانی لاوی دەستپێدەکات .

٥- **پابەندبوون + حەز**/ ئەم پەیوەندییە ناودەبرێت بە (( خۆشەویستی کوێرانە )) ئەم پەیوەندییە ئازار بەخشە وەك ژن و پیاوێك کە یەکتریان خۆشناوێت و پەیوەندی سۆزداری لە نێوانیان ساردە بەڵام زۆر جار بەهۆی غەریزەی سێکسییەوە ئاشت دەبنەوە و ماوەیەکی کەم بەردەوام دەبن و ئەم سۆزدارییە لە ماوەیەکی کورت لەناو دەچێت و کۆتایی دێت لە جێگەی نەفرەت دەنێژن ئەمە سەبارەت بەو کەسانەیە کە لە یەك نیگا یەکتریان هەڵبژاردووە بەبێ بیرکردنەوە کە ئایا بۆ یەکتر گونجاون یان نا ، بە خێرایی بڕیاری هاوسەرگیرییان داوە بەڵام دوای ئەوەی کە ئاگری حەز و ئارەزوو کوژایەوە کێشەکان دەستپێدەکات .

٦- **سۆزداری + حەز**/ ئەم جۆرە ناودەبرێت بە (( خۆشەویستی ڕۆمانتیك )) ئەم جۆرە پەیوەندییە زیاتر لە نێوان کوڕ و کچانێکە کە یەکتریان خۆشدەوێت بەڵام هێشتا هاوسەرگیرییان نەکردووە و نازانن کە ئایا ڕۆژێك هاوسەرگیری بکەن و بەردەوام بەوەوە ئازار دەکێشن .

٧- **سۆزداری + پابەندبوون + حەز**/ ئەم پەیوەندییە پێی دەوترێت (( خۆشەویستی تەواو)) کە بە بۆچوونی سترنبرگ پەیوەندیەکە کە زۆرێك لە خەڵکی هەوڵی بۆ دەدەن بۆ ئەووی




پێی بگەن . ئـەم خۆشەویسـتییە بـەبێ کـەم و کورتییـەو تـەواوە . ( مجـد ، مجـد ،٢٠١١ ، ص ٨٥– ٨٨ )

## چوارەم : ( جان لی )

جان لی جۆرەکانی خۆشەویستی بە ڕەنگە سەرەکی و ئەسڵیەکان بـەراورد کـرد ، ڕێـك بـەو شـێوەیەی کەسـێ ڕەنگـی سـەرەکی بـوونی هەیـە ، جـان لـی سـێ جـۆری سـەرەکی بـۆ خۆشەویستی داناوە ،جان لی بەردەوامی لێکچوونەکەی دەڵێن کە بـەو شـێوەیەی سـێ ڕەنگـی سەرەکی لەگەڵ یەکدا تێکەڵ دەبن و ڕەنگەکانی تر بەدی دەهێنن و تـەواویان دەکـەن ، ( بـەم شێوەیەش ) دەتوانێت ئەو سێ جۆرەی خۆشەویستی لەگەڵ یەك تێکەڵ بکرێن و جۆری جیاواز و خۆشەویستی لاوەکی بەدی بهێنن ئەویش بەم شێوەیە :

بەشەکانی خۆشەویستی سەرەکی :

١) **خۆشەویستی بۆ کەسێکی دیاری کراو**

٢) **خۆشەویستی یاری**

٣) **خۆشەویستی هاوڕێیانە**

بەشەکانی خۆشەویستی لاوەکی :

١- **خۆشەویستی شەیدایی و وەسواسی** : لە ئـەنجامی ((**خۆشەویستی بۆ کەسێکی دیاری کـراو و خۆشەویستی یاری**)) دروست دەبێت .

٢- **خۆشەویسـتی ڕاسـتی و کـرداری** : لـە ئـەنجامی(( **خۆشەویسـتی یـاری و خۆشەویسـتی هاوڕێیانە**)) دروست دەبێت .

٣- **خۆشەویستی فیداکارانـە** : لـە ئـەنجامی ((**خۆشەویسـتی بـۆ کەسـێکی دیـاری کـراو و خۆشەویستی هاوڕێیـانە**)) دروست دەبێت . ( www.psychology.about.com)




## پێنجەم : ( ئیرك فرۆم )

فرۆم پێی وایە خۆشەویستی پێك دێت لە چوار بەشەوە :

**١ – سەرنجدان و ئاگاداربوون**

**٢ – بەرپرسیاریەتی**

**٣ – رێزگرتن**

**٤ – دانایی**

وە هەروەها فرۆم پێی وایە خۆشەویستی بە دوو شت دەناسرێتەوە :

**١ – پەیوەندی قوڵی هەردوولا [ دوولایەنە ]**

**٢ – شادی**

هەرکات پەیوەندییەك یان هەستێکمان بینی کە ئەم دوانەی تێدایە ئەو کات پێویستە ناوی خۆشەویستی لێ بنێین . ئیرك فرۆم پێمان دەڵێت کە نیشانەکانی کەسەکە لە پەیوەندی پوڵی دوولایەنە چییە ، سێ خاڵ لە ئەم سێ وشە بوونی هەیە :

أ) **پەیوەندی** : پەیوەندی یەکێکە لە خاڵە بەهێزەکانی خۆشەویستی ، بەبێ پەیوەندی خۆشەویستی دروست نابێت ، خۆشەویستی بەرهەمی بەیەکگەیشتنەکانە نەك دوورکەوتنەوە . خۆشەویستی هەستێکی مرۆڤانەیە و مرۆڤی بێ پەیوەندی پێی ناوترێت مرۆڤ.

ب) **قوڵی** : خۆشەویستی وەکو گوڵ لەسەر دەریا ناژیت ، خۆشەویستی ماسی گەورەی ناو ئاوی قوڵە ، لە ئەنجامی خۆشەویستی بە هۆی مرۆڤە گەشەی کردووە ، مرۆڤێك کە خۆی قوڵە و توانای درککردنی قوڵی کەسی بەرامبەر هەیە ، خۆشەویستی یاری منداڵانە نییە هەرچەندە دنیایەکی منداڵانی هەیە !

ت) **دوولایەنە** : خۆشەویستی بەرهەمی پەیوەندی دوولایەنەیە . (( خۆشەویستی یەك لایەنە )) لە ڕاستیدا نزیك نییە بەم ناوەوە .

پ) **شادی** : شادی واتە هەستی ڕازی بوون، ڕازی بوون بەوەی کە لێرە ئامادەم و لە ئەم هەوایە هەناسە دەدەم و بەری ئەم زەویە دەخۆم و دەخەوم و هەڵدەستم و بە تەواوی بوونمەوە تامی خۆشی ژیان هەست دەکەم . ( شعیبی ، ٢٠١٣ ، ص ٢٥ – ٢٧ )




# بەشی سێیەم

- حەز ، خۆشەویستی، عەشق

- خۆشـــەویستی و سیــێکس

- پـــاڵنەرەکانی خۆشەویستی

- نیـــشانەکانی خۆشەویـــستی

- خـــاسیەتەکانی خۆشەویستی




# بەشی سێیەم

## * ( حەز ، خۆشەویستی ، عەشق )

لەسەرەتادا پرۆسەی حەزلێکردن و خۆشەویستی لێك جیا دەکەینەوە ، پێویستە ئاگاداری ئەوەبین حەز لێکردن و خۆشەویستی تێکەڵ بە یەك نەکەین !

**حەز لێکردن** پرۆسەیەکی تاکەکەسی خەیاڵییە و بۆماوەیەکی دیاری کراو ڕوودەدات ، ئەشێت بۆ کاتێکی سنووردار و دیاری کراو حەزێکت تیا دروست ببێت بەرامبەر ئەویدی کە پەیوەندیدار بێت ، بۆ نمونە بە ڕوخساری ، خەسڵەتێکی دیاری کراوی دەبێتە جێی سەرنجی بەرامبەر ، قسەکردن ، جل و بەرگی ... هتد ، کە لە دەرەنجام دەشێت ئەو حەزە بەرەو نەمان و پووکانەوە بچێت یان بەردەوامیەتی هەبێت و گەشە بکات بۆ خۆشەویستی . بە دیوێکی تردا حەزلێکردن زۆرجار تاکلایەنانەیە واتە دەشێت حەزی لایەك بێت بۆ ئەوی دی بێ ئەوەی لایەنی دووەم بە ئاگابوون و هەمان هەستی بۆ کەسی یەکەم هەبێت یان بە دیوێکی تردا مەرج نییە دەنگ و پەیامی بگاتە ئەو کەسەی حەزی لێ کردووە ، هەندێ جاریش پرۆسەیەکی دوولایەنەیشە بۆ ماوەیەکی کورت و پاشان لاواز دەبێت و بەرەو نەمان دەچێت . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ٧٧ – ٧٨ )

هەر پیاوێکی ئاسایی لە زۆربەی کاتدا چاوی بە هەر ژنێ دەکەوێ حەزی لێ دەکات ، هەر ژنێکیش بەسەر و سیماش کە بەلای پیاوێکدا بڕوات ، لە هەستیاری پیاوانەی ئەودا خرۆشان و جوڵەیەك بەرپا دەکات ، کە دەبێتە هۆی مەیل پەیدا کردنی سروشتیانەی ئەو پیاوە بەرامبەر بە ئەو ئافرەتە. ( گاست ، ٢٠٠٢ ، ص ١٠٠ – ١٠١ )

بەڵام **خۆشەویستی** بریتییە لە ویستی خۆشی بۆ بەرامبەرەکەت واتە : ئاڵوگۆڕ بە جێی وشەکان کراوە ، ئەو ویستی خۆشیەی کە تۆ هەتە بۆ بەرامبەرەکەت ، مەبەست پێی ئەوەیە چێژ و سۆز و حەنانت بیدەیتە بەرامبەرەکەت ، هەرکاتێك ویستێکی وا لە دڵتا دروست بوو ئەوا ئەو کەسەت خۆشدەوێت . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٦٩ )




خۆشەویستی بە بەراورد لەگەڵ حەزلێکردن دوو چەمکی جیاوازن . پرۆسەیەکی ئەقڵی ، دەروونی ، جەستەیی و ئۆرگانییە کە لە نێوان دوو کەسدا ڕوودەدات و دەتوانرێت بوترێت ئەگەر حەزلێکردن بەردەوامیەت و درێژەی هەبێت دەگۆڕێت بۆ خۆشەویستی کە لەم قۆناغەدا مرۆڤ لە جیهانێکی تاکڕەو و تاکجەمسەری و من خوازییەوە دەگوازرێتەوە بۆ جیهانێکی جووتەکی نوێ و گۆڕانێکی بنەبڕ و ڕیشەیی و جیاواز و تایبەت لە کۆی جیهانبینیماندا دروست دەکات ، ئەم چەمکە بە پێچەوانەی حەزلێکردنەوە کورتخایەن نییە و دامرکانەوەیشی زەحمەتە ، ئەو هەستەیە کە نزیکبوونەوە جۆش و خرۆشی و چێژێکی تایبەت بەو دوو مرۆڤە دەبەخشێت و بە دورکەوتنەوەیان هەمان هەست زیندوو دەکاتەوە ، بە شێوەیەك هیچ سنورێکی جوگرافی ، کات ، تەمەن ، دەوڵەمەندی ، هەژاری، ئاستی کۆمەلآیەتی ... هتد هیچ کاریگەریان نابێت لەسەر ڕێگرتن یان بەرگرتن لە دروست بوونی ئەو هەستەدا . ( سیوەیلی ، ٢٠١٠ ، ل ٢٧ –٢٩)

خۆشەویستی نە کورت خایەنە و نە دادەمرکێتەوە ، ڕاستە بلێسەی نامێنێت وەلێ ژیلەمۆکەی هەر هەیەتی تەنانەت بە دابڕان دوو کەسەکەش لە یەکتری . نە دوورکەوتنەوەی جوگرافی و ئاوارەبوونی ولآتان و نە تێپەڕبوونی کات و تەمەن و ئەو ساتانەمان بیر دەبەنەوە کە ئێمە لە ڕوانگەی دەورووبەردا وەك شێت و دێوانە تەماشا دەکراین و لە ڕوانگەی خۆشمانەوە ئەڤیندار و مەست . (سیوەیلی ، ٢٠٠٤ ، ل ٢٨ )

ئەگەر لە پرۆسەی حەزلێکردندا نێرەر تاکەکەسە و وەرگر هەموان و هیچ کەس ، ئەوە لە خۆشەویستیدا نێرەر لە هەمان کاتیشدا وەرگرە و وەرگریش نێرەرە . خۆشەویستی لە نێوان ئەم وەرگرتن و ناردنەوەیەدا ، لە نێوان ئەم بەخشین و بەخشینەوەیەدا دروست دەبێت و دروستمان دەکات ، ئەگەر لە میانەی ژیانی ڕۆژانەدا تاکەکەس بۆی هەبێت حەز لە چەندین کەس بکات و لە هەموو حەزلێکردنەوەیەکیشدا برێ وزە لەدەست بدات ، ئەوە بە بۆچوونی من بۆی هەیە تاکە یەك پەیوەندی خۆشەویستی لە هەموو تەمەندا بەس بێت بۆ ئەوەی پڕمان بکات لە وزەی بەردەوامی و تازەبوونەوە . ( سیوەیلی ، ٢٠٠٤ ، ل ٢٩ – ٣٠ )

بەلآم سەبارەت بە چەمکی **عەشق**، وشەی عەشق لە ناوی ڕوەکی (( عەشەقە )) وە هاتووە کە گیایەکی خۆی لە درەخت دەئالێنێت و ئاوەکەی هەڵدەمژێت و زەردی




هەڵدەگەڕێنێت و دەبێتە هۆی وەرینی گەڵاکانی و لـە کۆتاییشـدا وشـکی دەکـات . ( مشـیری ، ١٣٧٨ ، ص ٧١٧ — ٧١٨ )

عەشق لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبییە و ئەو زمانانەی کە لە عەرەبییەوە نزیکن وەکـو (( فارسی و کوردی و تورکی )) پێدەچێت زمـانی تـریش ، وشـەکەیان بـە هـەمان شـێوە بـەبێ دەسـتکاری وەرگرتـووە ، عەشـق بـۆ خۆشەویسـتییەکی قـوڵ بـەکاردەهێنرێت ، بۆیـە مـرۆڤ حەزێکی سادەی بۆ هەر شتێك ناونانێت عەشق و ناڵێت عاشـقی ئـەوم . ( ئیـبراهیم ، ٢٠١١ ، ل ٢٧ )

چەمکی عەشق زیاتر لە نێوان دواندا ڕوودەدات کە یـەکێکیان مرۆڤـە و ئـەویتریان مـەرج نییە مرۆڤ بێت ، وەك لە نێوان مرۆڤ و خودادا ڕوودەدات یان لە نێوان کـوڕ و کچێکدا ڕوودەدات کە یەکێکیان لەبەرچـاو ئـەویتریان ئەبێتـە ئەفسـانەیەك ، پەریـەك ، فریشـتەیەك ، لـە مرۆڤێـك دەردەچێت و کەسی بەرامبەری لێ دەبێتە ئەفسونێك ، لێی دەبێتە خوا ! ( شاسـواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٧٢ )

کاتێك عەشق بە کەماڵی خۆی گەیشت ، هێزەکانی عاشق تێکدەشـکێنێت و هەسـتەکانی لە کار دەکات و نەفەس بۆ خـواردن دەمـرێنێ و جگـە لـە قسـەکردنیش لەسـەر یـار بـە هـەموو شتێکی دی مـەلوول دەبێـت ، نەخۆشـدەکەوێ و دەبێتـە دێوانـە و هـیلاك دەبـێ . ( مشـیری ، ١٩٩٧ ، ص ٢٢)

عەشق وەك وتمان ئەکرێ پەیوەندی مرۆڤ بە بوونەوەرێکی نامرۆڤانەوە بێت کە دەشێت یـەزدان بێت وەك ئەوەی لە تەسەوفی ئیسلامیدا هەیە و بـەو پێیـەش سـۆفی کەسـێکە جگـە لـە یـەزدان عاشقی کەسی تر نابێت . هەروەها دەشێت ئەو عەشقە عەشق بێت بۆ ڕەمز و پانتاییەکی پیرۆز کە دەلالەت لە یـەزدان بکـات ، وەك ئـەوەی لـە بـیر و ڕای ئانیمیسـتێکدا * بـەدیار دەکـەوێت . پەیوەنـدی مـرۆڤ بـە یەزدانـەوە پەیوەندییەکـە لەسـەر بنـەمای باوڕارییـەوە دادەمـەزرێت و

---

*ئانیمیست ئەو مرۆڤەیە کە بڕوای وایە یەزدان لە هەموو شوێنێك و شتێکدا ئامادەیی هەیە و بەم پێیەش ئەو ئەو دەتوانێت خۆشەویستی خۆی بۆ چڵێ گیا ، بۆ دڵۆپێ ئاوێـك وەك ڕەمـزی یـەزدان دەربـڕێ . ( مـالرب ، ١٣٨١ ، ص ٢٥٤ — ٢٥٥ )




مرۆڤدەکاتــە ناوجیهــانی میتافیزیکیەتــەوە کــە چــەپاندن یــەکێك دەبــێ لــە جۆرەکــانی بەرجەستەبوون . (سیوەیلی ، ٢٠٠٤ ، ل ٣٦ )

## * خۆشەویستی و سێکس :

لە کۆنەوە پەیوەندییەکی بەهێز هەبووە لە نێوان سێکس و خۆشەویستی ، ئایا سـێکس شێوازێکی دەربڕینی خۆشەویستییە یان دوا قۆناغی خۆشەویستی سێکسە ؟ بۆچـوونەکان لـەم بوارەشدا دابەش بوون بۆ دوو گروپ ، گروپی یەکەم پێیان وایە سێکس هیچ پەیوەندییـەکی بـە خۆشەویســتییەوە نییــە ، خۆشەویســتی پــاك و بێگــەردە و دووره لــە هــەموو بەرکــەوتنێکی جەستەیی ، هەر کاتێك جەستەی خۆشەویستان بەریەك کەوتن واتـای خۆشەویسـتی نامێنێـت ، بە واتایەکی تـر خۆشەویسـتی لـەو شـوێنە دەمرێـت کـە سـێکس دەسـتپێدەکات ئـەوەش پێـی دەوترێت خۆشەویستی پاکیزەیی . گروپی دووەمیش پێیان وایە ئەنجامـدانی کـاری سێکســـی کاردانەوەیـــەکی ئاسـایی خۆشەویستیەیە ، بەڵکو خۆشەویستی بـەبێ کـاری سێکسـی شـتێکی بـێ واتـا و ناتـەواوە ، ئـەوان پێیـان وایـە سـێکس کارایـەکی گرنگـە بـۆ بەرجەسـتەکردنی ئـەو خۆشەویســـتیەی کـــە تـــەنها لـــە خـــەیاڵاتی کەســـانی خۆشەویســـتووە ، واتـــە ســـێکس ڕەنگدانەوەیجەستەییە بۆ خۆشەویستی ڕۆح ، ئەگەر چی هەردوو لـە گـروپ دوو ئاڕاسـتەی دژ یەك هەیە ، بەڵام ئەمە ی لەسەری کۆکن ئەوەیە کە سێکس کارایەکی گرنگە لـە خۆشەویسـتیدا ، چ بە ئەرێنی چ بە نەرێنی بێت . ( سایك ، ٢٠٠٦ ، ل ٣٠ )

لەسەر ئاستی مرۆڤایەتیـدا سـێکس لـە پـێش خۆشەویسـتییەوەیە ، مێـژووی مرۆڤایـەتی سـێکس دەیبزوێنـێ و درێـژەی پێـدەدات . بـوونی ئێمـە بەرهـەمی پرۆسـەیەکی سێکسـییە ، ئاشکرایە ئەگەر ئەو پرۆسەیە ئەنجام نەدرێت و نەمێنێت ، بەدوایدا جۆری مرۆڤایەتیش قڕی تێ دەکـەوێت ونامێنێـت . بۆیـە سـەبارەت بـە مرۆڤایـەتی : سـێکس ئامانجـە و خۆشەویسـتی کەرەستەیەکە لە پێناوبەدیهێنانیدا ، بایەخ و پێگەی سێکس بۆ درێژەدان بـە ژیـان و مانـەوەی مرۆڤایەتی ، بە ئەندازەیەکی هەرگیز لەگەڵ خۆشەویستیدا نایەتـە بـەراورد کـردن . ( بۆکـانی ، ٢٠٠٨ ، ل ١٦٣ )




نه خۆشەویستی بەبێ سێکس دەبێت و نه سێکسیش بەبێ خۆشەویستی ، چونکه ئەگەر سێکس ڕەت بکرێتەوه ئەوه مرۆڤ له گەورەترین لەزەتی مادی بێبەش دەبێت ، ئەو لەزەتەی که هەر لەگەڵ دابەزاندنی مرۆڤ له ئاسمانەوه پێی بەخشراوه ، خۆ ئەگەر لە خۆشەویستیش بێبەش کرا ، ئیتر له هەموو ئەو خرۆشییه فیتریانه بێبەش دەبێت که له ئاسمانەوه بە ڕۆح وه لەسەر زەمیندا بۆ بەختەوەری بە مرۆڤ بەخشراوه ، ئەوەش لە ئاکامدا دەبێتە هۆی سەرگەردانی هەمیشەیی مرۆڤ . (محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ١٩٤)

خۆشەویستی و سێکس له ڕووی گرنگییەوه هیچیان لەوی تریان کەمتر نییە . سێکس به تەنها فشارێکی هۆرمۆنی جەستەییه و خۆشەویستیش سۆزێکی دەروونییه و سێکسی نێوان دوو ڕەگەز جوان و ڕەنگین دەکات ، ئەگەر سێکس دۆخێکی کاتی بێ و به تەنها بریتی بێت لە خاڵی کردنەوەی حەزێکی جەستەیی و چەند چرکەساتێك بخایەنێت ، ئەوا خۆشەویستی دۆخێکی هەمیشەییه و بەردەوام دەژی و درێژ دەبێتەوه.

له سێکسی بێ خۆشەویستیدا دوو جەسته لەوانه شه تەنها دوو ئەندام بۆ چەند چرکه ساتێك بەیەك بگەن و دواتر لەیەرك دوور دەکەونەوه و ڕەنگه ڕقیشیان له یەکتری بێت ، بەلاّم له خۆشەویستیدا دوو مرۆڤ به هەموو خەسڵەتەکانیانەوه پێکدەگەن و ئاوێزانی یەکتری و بێزار نابن . ( بۆکانی ، ٢٠٠٨ ، ل ١٦٤ – ١٦٥ )

هەر بەرکەوتن و جووت بوونێکی سێکسی بەبێ بوونی خۆشەویستی دەبێتە کارێکی جەستەیی ڕووت و ئەو تام و چێژه به مرۆڤ نادات وەك ئەوەی خۆشەویستی هەبووبێت ، زۆر جاریش نەبوونی خۆشەویستی له میانەی کاری سێکسی وا له مرۆڤ دەکات تووشی کاری ناوازه ببێت و سروشتی مرۆڤانەی خۆی لەدەست بدات ، بەڵکو دادەبەزێت بۆ ئاستێك له ئاژەڵ نزمتر ، کەواته هەبوونی خۆشەویستی له میانەی کاری سێکسیدا شتێکی حەتمییه ، لێرەوه دەتوانین بڵێین سێکس کەناڵێکه له کەناڵەکانی دەربڕینی خۆشەویستی ، بەلاّم ئەم کەناڵه پێویسته لە کات و شوێنی گونجاو بەکار بهێنرێت ، ئەگەر نا ئاکامی خراپی لێ دەکەوێتەوه . ( سایك ، ٢٠٠٦ ، ل ٣٠ )

له کۆتاییدا پێویسته ئەوەش لەیاد نەکەین که ڕعایەتی زیادەڕەوی له دابوونەریتی ئەخلاقی ، سەبارەت به کرداری سێکسی هێزی خۆشەویستی زیاد دەکات دەربڕینی تونیەتی سێکسی




ڕەنگە بگۆڕدرێت بە خۆشەویستی ئەوەی زۆر گرنگە لە پەیوەندی سێکسیدا زیاتر لایەنی دەروونییە نەك جەستەیی ، هەرچەندە لەگەڵ ئەوەی کە لایەنی جەستەیی خۆشەویستی لە هاوسەریدا بە تێپەڕبوونی ساڵەکان زیاد لە حەد لاواز و سەرەنجام لەناو دەچێت بەلاَم لایەنی دەروونی مرۆڤ بە سەلامەتی دەمێنێتەوە حەرارەتی خۆشەویستی و عەلاقەی بەرامبەر ئەتوانێت تا کۆتایی تەمەن هەتا کاتێك کە هێزی سێکسیش بە تەواوی لەناو دەچێت ئەو بە زیندو بە پاکی بمێنێتەوە ، وەك چۆن بۆ نمونە باوەش پیاکردنێك یان گوشینی دەست یا سەیرکردنی عاشقانە و حەرەکاتی سەرنج ڕاکێش کە پێویستە تا کۆتایی تەمەن بپارێزرێت . ( کاپریز ، ٢٠١٢ ، ل ٣٢٤ )

## * پاڵنەرەکانی خۆشەویستی :

دروست بوونی خۆشەویستی بەهۆی چەند پاڵنەرێکەوەیە کە وا دەکەن خۆشەویستی بێتە بوون لەوانەش :

### ١ . پاڵنەری کۆمەلاَیەتی :

به شێوەیەکی گشتی لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا بوونی سۆز و خۆشەویستی یارمەتیدەرە بۆ پتەوبوون و مامەڵەکردنی مرۆڤەکان لە ڕووی مرۆیی و هاوسۆزییەوە ، چونکە فەرامۆشکردنی ئەو هەستە کۆمەڵگا دەبێتە هاوشێوەی جەنگەڵستان . ( دریع ، ٢٠٠٨ ، ص ٨ )

لەم ڕوانگەیەوە دوو هۆکاری سەرەکی هەن سەبارەت بە گرنگێتی بوونی خۆشەویستی لە ڕووی کۆمەلاَیەتییەوە ئەوانیش :

أ ) **پێویستی پشتیوانی خۆشەویستی** :

لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا پێداویستی هەستکردنی بە پشتیوانی کردنێك بوونی هەیە بەو واتایەی پێویستی بە سۆز و پشتیوانی لێکردنی کەسێکی دیکە دەبێت تا لە کاتی پێداویستیدا هاوسۆزی بۆی هەبێت چ لە کاتی ناخۆشی و نیگەرانییەکانیدا بێت یا لە کاتی خۆشی و ئارامییەکانیدا ، چونکە زۆرێك لە مرۆڤەکان بەهۆی نەبوونی ئەو کەسە لە پاڵیدا هەست بە




تەنیایی و بۆشاییەکی زۆر دەکەن و زۆر جاریش ئەو کەسانەی بێبەش دەن لە بوونی ئەو مرۆڤە لە ژیانیاندا بەدەستەواژەی ۆر بە جۆر گوزارشتی لێ دەکەن .

ب ) **پێویستی هاوسەرگیری** :

پرۆسە و سیستمی هاوسەرگیری بناغەی بەردەوام و بوونی مرۆیی و خێزانە ، چونکە خێزانە کەوا لە کۆمەڵگە دەکات ڕێکخراو بێت و بە شێوەیەکی گشتی بناغەی دروستکەری ڕێکخستنی پەیوەندییەکانە لە کۆمەڵی مرۆییدا . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٧ – ١٥٨ )

کاتێك تاك بەرەو تەمەنی پێگەیشتوو (( ١٨ساڵ یان زیاتر )) دەڕوات هەوڵی دوو شت دەدات ئەوانیش هاوسەرگیری و پەیداکردنی ئیشە هەرچەندە بەهۆی جیاوازی تاکایەتی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە بەڵام بە شێوەیەکی گشتی تاك لەم تەمەنەدا هەوڵی ئەو دوو شتە دەدات بە تایبەت هاوسەرگیری چونکە پێویستی بە سۆز و خۆشەویتی هەیە . ( شعیبی ، ٢٠١٤ ، ص ٧ )

## ٢ . پاڵنەری دەروونی :

خۆشەویستی هەر وێنە و شێوەیەك بێت و مرۆڤ لە هەر تەمەنێکی ژیانیدا بێت بناغەیە بۆ تەندروستی دەروونی ، بەڵام خۆشەویستی نێوان ژن و پیاو هۆکاری دەروونی تایبەت بە خۆی هەیە ، هۆکاری ئەوانەش لەمانەدا کۆ دەبێتەوە :

أ ) **پێداویستی هاوەڵی** :

هاوەڵ یان هاوڕێیەتی پێداویستییەکی مرۆییە کە بە شێوەیەکی تایبەت خۆشەویستی ئەوە دەخوڵقێنێت ، چونکە ئەو جۆری پەیوەندییە وا لە مرۆڤ دەکات توانای بەشداری کردنی لایەنی دووەم یان ئەوی دی هەبێت لە ڕووی بەها و هەست و بایەخ و ئامانج و چێژەکانی لە ژیاندا و مرۆڤ باشتر هەست بە هەموو مەسەلەیەك دەکات کە پێشتر ڕووی دابێت گەر مرۆڤێکی دیکە هاوبەشی بکات ، چونکە بێ بوونی مرۆڤێکی دی و بێ هاوەڵێك ، بەها و هەست و بایەخەکانی مرۆڤ بێ تام و بێ ژیان دەبێت . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٨ – ١٥٩ )




هاوڕێیەتی یەکێکە لەپێداویستییە گرنگەکان بۆتاك ئەگەر چی خاوەنی ژیانێکی بێ کەم و کورتیش بێت ئەمەش بەمەبەستی چێژ وەرگرتن لەخۆشییەکانی ژیان و بونی هاودەم لەکاتی تەنگانە و هاوڕێیەتی لەهەموو قۆناغەکانی تەمەندا گرنگی خۆی هەیە و بوونی هاوڕێ هەر پشت و پەنایە بۆتاك .(الصباغ ، ب . س ، ص ٩ )

ب ) **پێداویستی خۆشویستنی کەسێك یان کەسێك خۆشی بوێین :**

مرۆڤ لە ژیاندا پێویستی بەوە هەیە کەسێکی خۆشبوێت یان کەسێك خۆشی بوێت ، ئەوەش لەو ڕوانگەوەیە کە مرۆڤ پێویستی بەوەیە کە هەستە مرۆییەکانی لە چالاکبووندا بێت لەوانە دڵ و ئەندێشەی مرۆڤ پێویستە کە بجوڵێت و ترپەکانی ڕووبکاتە کەسێکی دی و گرنگتر مرۆڤێك هاوبەشی هەست و سۆزەکانی بکات ، چونکە مرۆڤ بە سروشتی پێکهاتەی خۆی خۆشەویستی دەکات لەبەر ئەوەی پێویستی بە ورۆژاندن و ئاراستەکردنی بایەخ و هێز و تواناکانی هەیە لەلایەن ئەویدییەوە هەروەك چۆن پێویستی بەوە هەیە کە هەست بەوە بکات کەسێکی دی دەوروژێنێت ، لەبەر ئەوەی هەڵگری خەسڵەتێکی وروژاندنین و دەمانەوێت هەست بە بەها و سەنگی خۆمان بکەین و بە بایەخی کەسێکی دیکە بۆ خۆمان ، چونکە مرۆڤ ئەگەر توانی کەسێکی خۆشبوێت و کەسێکی دیکەش ئەوی خۆش بوێت هەست بە خۆی دەکات کە شتێکی گرنگە و بە پێچەوانەشەوە هەست دەکات هیچ نییە ، ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٩ )

هەروەها ئەگەر سەیری هەرەمەکەی ماسلۆ بکەین بۆ پێداویستییەکانی مرۆڤ دەبینین لە دوای پێداویستی فسیۆلۆجی و پێداویستی ئاسایش لە پلەی سێیەم پێداویستی کۆمەڵایەتی دێت کە خۆی لە خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی دەبینێتەوە کە بە بۆچوونی ماسلۆ ئەم پێداویستییە هیچی کەمتر نییە لە دوو پێداویستییەکەی پێشووی چونکە مرۆڤ بونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و پێویستی بە سۆز و خۆشەویستی هەیە . ( رضائيان، ٢٠٠١ ، ص ١٠٤ )

## ٣ . پاڵنەری جەستەیی :

یەکێکیتر لە پاڵنەرەکانی خۆشەوستی بریتییە لە پاڵنەری جەستەیی کە لەم کاتەدا جەستە پێویستی بەو خۆشەویستییە هەیە کە ئەویش خۆی لەم پێویستیانەدا دەبینێتەوە :




أ / **پێویستی پێكەوە نووسان** :

پێویستی پێكەوە نووسان و باوەش پیاكردنی نێوان خۆشەویستان لە بناغەدا پێداویستییەكی بەركەوتنی پێست و جەستە و پێكەوە نووسانی خۆشەویستەكانە كە دەبێتە هۆی خولقاندنی ئارامی و ئاسایش و حەوانەوە و چالاكبوونی جەستە و پێستی مرۆڤ . ئەم جۆرە هەستە گرێ دراوی ئەو ساتە وەختەی هەستی سەرەتایی مرۆڤە كە لە سەرەتای لەدایك بوونی مرۆڤەوە كاتێك لە ناو رەحمی دایكدایە و ئەو بەرجەستە دەبێت و جەستەی یان پێستی پێویستی بە گرێدانەوەی هەیە لەگەڵ مرۆڤێكی دیكەدا و خۆشەویستان لە بەرامبەر هەستەكانیدا زیاتر داوا دەكەن ئەویش تێكەڵبوونیان بە جەستەی ئەوی دییەوەیە . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١١٥ )

لەو رووەوە پاولۆ كۆیلۆ دەڵێت : پێویستە مرۆڤەكان بەدوای نیوەی ونبووكەیاندا بگەرێن و لەباوەشی بگرین ، بەو لەباوەش گرتنەش وزە و توانای پێشوویان بەدەست دەهێننەوە ، توانایەك كە لە فریودان دەیانپارێزێت و توانای راوەستان و پیادەرەوی رێگای دوور و درێژ ، ئەو لەباوەش گرتنەی كە هەردوو جەستە كە تیایدا ملكەچی ئەوە نابن جارێكی دی ببنەوە بە یەك ، مەگەر لە رێی ئەوەوە نەبێت كە ئێمە پێی دەڵێین سێكس . (كۆیلۆ ، ٢٠٠٩ ، ل ٥ )

ب / **پێویستی تێربوونی سێكسی** :

تێروانینی جۆر بە جۆر هەیە لە لایەن كەسایەتی و بیردۆزە جیاوازەكانەوە ، هەندێك پێیان دەوترێت كەسانی زیادەرەو كە پێیان وایە خۆشەویستی بناغەیەكی پێویستییەكی جنسییە و قورسی دەربرینی لەلایەن مرۆڤەكانەوە وا دەكات پەردەپۆشی ئەم دەربرینە بە وشەی خۆشەویستی بكەن ، چونكە بۆ نمونە قورسە بەلای پیاوێكەوە بە ژنێك بڵێت (( حەزم لەوەیە جنست لەگەڵ بكەم )) بەڵام دەتوانێت بڵێت (( خۆشمدەوێیت )) .

بە شێوەیەكی سروشتی ئەم دەربرینە بیردۆزێكی جەستەیی پوختە بۆ خۆشەویستی ، بەڵام زۆرێك لە تێروانین و دەربرینەكانی دیكە وایدەبینن كە خۆشەویستی بە هۆكاری دەروونی و كۆمەڵایەتی و جەستەیی پێكەوە روودەدات . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١١٦ )

بە بروای (( فرۆم )) بۆ جووت بوون سنووردارە و بە جۆرێك لە خۆشەویستی دادەنێت ، لە كاتێكدا (( فرۆید )) پێی وایە هەموو ئامانجەكان لە هەر جۆرە خۆشەویستیەكدا تەنها جووت




بوونه ، بەڵام هەرچی (( سوقراتە )) لەو ڕوانگەوە لە هەردووکیان زیاتر دەڕوات کە پێی وایە ئەو شتەی پێی دەڵێن جووت بوون لە خۆشەویستییەوە پەیدا دەبێت وە ئامانجیش گەیشتنە بە جوانی موتڵەق ! وە هەروەها (( بریدیف )) دەڵێت ئاوێتە بوونی ژن و پیاو لە خۆشەویستیدا بۆ بەردەوام بوونی ڕەگەزی مرۆڤایەتی نییە ، بەڵکو بۆ گەشەکردنی کەسێتی مرۆڤ و ئەو ئارەزووە جەخت کردووەیە بۆ کامڵ بوون و نەرمی . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ٣٦ —٣٧)

جگە لەم پاڵنەر و هۆکارانەی کە باس کران کۆمەڵێك هۆکاریش هەن کە دەبنە هۆی ئەوەی تاك خۆی بە عاشق دەربخات بەڵام لە ڕاستیشدا عاشق نییە و تەنها دەیەوێت خۆی بە عاشق دەربخات وە بەم خۆشەویستیەش دەتوانین بڵێین خۆشەویستی درۆینە .

زۆر لە تازە پێگەشتوان و گەنجان ناوی ئارەزووە سێکسییەکانیان دەنێن خۆشەویستی , بە بینینی بالآیەکی بەرز و دوو چاوی مەست گیرۆدە بوون بەڵام ئەڵێن کچەکە زۆر ڕێك و پێکە و ڕۆحی جوان ! دەیەها شەو بە خەیاڵی سێکسی ئەوەوە خەو ئەیانباتەوە , بەڵام ناوی ئەنێن شەوی یەڵدای عەشق ! کە ئەمە ڕاست نییە و هەر شتێکی تریش بێت بێجگە لە خۆشەویستی ئەوەندە درۆ و نیافقی تێدا بێت هەر بێزراو و ناشرینە. ( خورشید , ٢٠٠٨ , ل ١٠ )

بۆیە مەرج نییە هەر کەس وتی من عاشقم ئیتر ڕاست بکات و پێی بڵێین عاشقە لێرەدا کۆمەڵێك لەو هۆکارانە باس دەکەین کە تاك وا لێ دەکات خۆی بە عاشق بزانێت :

### ١- هاوڕێیەتی :

یەکێك لەو هۆکار و ڕێگایانەی کە لاوان لێیەوە فێری خۆشەویستی درۆینە دەبن ، هاوڕێ و برادەرە ، لاو لە ڕێگای هاوڕێکەیەوە فێری شتی خراپ یان باش دەبێت ، هاوڕێکان لە نێوان یەکتری کتێب و شیعر و دەنگ و ڕەنگ لەسەر خۆشەویستی دەگۆڕنەوە بە شێوەیەکی هەڵە ، هەر چۆن یەکتری فێری جگەرە و عارەق و دزی و .... هتد دەکەن ئەویش بەم شێوەیە. ( نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل ٩٠ )

### ٢- تێکەڵاوی کوڕ و کچ :

ئەویش بەهۆی تێکەڵاو بوونی کوڕ و کچ جا لە هەر شوێنێك بێت ، قوتابخانە یان فەرمانگە یان ماڵ یان کار ... هتد ، تێکەڵاوی ئەو دوو ڕ̓ەگەزە زیان بە کۆمەڵگا دەگەیەنێت

هەر بۆیە ساڵی ٢٠٠٦ لە ئەمریکا لە چەند قوتابخانەیەك بەداوای قوتابیـان کـوڕ و کـچ لێك جیـا کرانەوە . ( نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١١٣ )

وە هەروەها جگە لەوەش تێکەڵاوی کوڕان و کچان لە ناوەندەکانی خوێندند اپرۆسـەی خوێنـدن تووشـی ئیفلیجـی دەکـات ، چـونکە لـە وەهـا کـەش و هەوایەکـەدا کچـان و کـوڕان هێنـدەی سەرگەرمی گرنگیدانن بە شکڵ وستایل و دیکۆری دەرەوەیـان نیـو هێنـدە خـەریکی خوێنـدنی وانـە و پێداچـوونەوە و گـوێگرتن نـابن لـە مامۆسـتا لـە کـاتی شـەرحکردنی وانەکەیدا، چـونکە ڕەگـــەزی بەرامبـــەری پانتاییـــەکی گـــەورەی لـــە مێشـــك و زهـــنی داگیرکـــردووە، بـــە پێـــی لێکۆڵینەوەکانیش کە وولآتانی ڕۆژئاواکراوە، ئـەو خوێنـدگا و قوتابخانانـەی کـە تێکـەلآو نـیین، خوێندکارەکانی زیرەکتر و سەرکەوتوو ترن لەو خوێندگا و قوتابخانانـەی کـە کـچ و کـوڕ تیایـدا تیکەولآون . ( زینو ، ب.س ، ص ٤٣ )

## ٣- دەزگاکانی ڕاگەیاندن :

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە لاوان لە ڕێگەیەوە بە هەڵە فێری خۆشەویسـتی دەن [ یـا فێری خۆشەویستی درۆینە دەبـن ]کاریگـەری دەزگاکـانی ڕاگەیاندنـە جـا تەلـەفزیۆن بێـت یـان کەناڵی ئاسمانی یان ڤیدیۆ یان سینەما یان ئەنتەرنێت و ڕۆژنامە و .... هتد. ( نەجار ، ٢٠٠٩،ل ١٠٥ )

بە تایبەت ئەو فیلم و زنجیرانەی کە ڕۆمانسین کە بە شێوەیەکە ئەو ژیانە ڕۆمانسییەی نێو ئـەو زنجیرەیە دوورە لـە ڕاسـتییەوە و وێنەیـەکی درۆزنانـە نیشـانی بینـەر دەدات ، کـاتێکیش ئـەم گەنجە بینەر و تەماشاکەرە ، لە نێو کۆمەڵگا بە دوای ئەو جۆرە خۆشەویستییە دەگەڕێ کە لە نێو فیلمەکەدا بینیویەتی و لە کۆتاییدا نایدۆزێتەوە ، چونکە ئەوان ئەکتەرن و نەمایش دەکـەن ، بۆیە گەنجەکە کاتێك ئەو کەسـە نادۆزێتـەوە توشـی شـۆك و داتـەپینی بـارێکی دەروونـی زۆر بەهێز دەبێت و کەسانێك کە ڕەنگە بە ئەستەم بناسرێتەوە . ( شوانی ، ٢٠٠٩ ، ل ٥٨ )

هەندێ لە زانایان توێژینەوەیـەکیان لەسـەر (( ٥٠٠ )) فـیلم کـرد سـەرەنجام دەرکـەوت ٪٧٠ ی بابـــەتی فیلمـــەکان بریتییـــە لـــە تـــاوان و عەشـــق و بەدڕەوشـــتی کـــە لـــە خـــۆی گرتـــووە . (نەجار،٢٠٠٩،ل١٠٧)




## ٤- دەستبەتاڵی و بێکاری :

یـەکێکی تـر لـەو هۆکارانـەی کـە لاو لـە ڕێگەیـەوە تووشـی داوی دڵـداری دەبێـت دەسـتبەتاڵییە و بـێ ئاکارییـە ، زانایـانی (( دەروونـی و پـەروەردەیی )) لـە وڵاتـانی ڕۆژئـاوا کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە بەتاڵی بە یەکێك لە هۆکارە گەورەکانی ڕوودانی تـاوان دادەنرێـت ، وە کۆکن لەسەر ئەوەی ئەگەر گەنج لە کاتی بەتاڵیدا بە تـەنها لەگـەڵ دەروونـی خۆیـدا مایـەوە وە بۆچوونی خەیاڵتوی و ئارەزووی خراپ و وەهمـی جنسـی وروژێنـەری بـە مێشـکدا هـات ئـەو دەبێ گومان کاتێك خۆی دەبینێتەوە ، کە بە دەم ئارەزوو هەوای جنس و خەیاڵیدا ڕۆشتووە . ( نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل١١٦-١١٧ )

لە کۆتاییدا ناو لەم پەیوەندییە دەنێن خۆشەویستی و لە سەرەنجامدا هەموو گوناهەکانیش بەم ناوەوە دادەبڕێ ، دواتر خۆشەویستی بەستەزمانیش مرۆکێکی ڕەش بە ناو چاوانییەوە دەنرێ. (شوانی ، ٢٠٠٩ ، ل ٥٩ )

## * نیشانەکانی عەشق و خۆشەویستی :

هەر دیاردە یان گۆڕانێك یـان نەخۆشـییەك بەسـەر مرۆڤێکدا بێـت و لـە ناخیـدا ڕوودەدات نیشانەی خۆی هەیە ، عەشق و خۆشەویستیش لەمە بەدەر نییە و چەندین نیشـانەی هەیـە کـە بە بینینیان دەزانیت خاوەنەکەی عاشقە یان نا .

پـێش ئـەوەی باسـی نیشـانەکانی خۆشەویسـتی بکـەین پـێم خۆشـە ئـەوە ڕوون بکەمـەوە کـە نیشـانەکان بـە جیـاوازی دەروونـی کەسـەکان دەگۆڕێـت و مـەرج نییـە لای هـەموو کـەس ئـەم نیشـانانە وەك یـەك بـن . دێینـە سـەر باسـی هەنـدێ لـە نیشـانەکانی دەرکـەوتنی عەشـق و خۆشەویستی کە لە مرۆڤی عاشقدا بەدی دەکرێن و دەبینرێن :

١) مرۆڤی عاشق بە چـاویدا دەردەکـەوێت کـە عاشـقە ، بـە تایبـەت کـاتی نزیککەوتنـەوەی لـە مەعشووقەکەی ، عاشق بەردەوام چاوەکانی دەبڕێتە مەعشوقەکەی و جێگەی مەعشـوقەکەی ،




خۆ ئەگەر ئەو چاوەکانی بەرز کردەوە ئەم دایدەخات و ڕوانینەکانی خۆی لێ دەشارێتەوە .

(خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٤٧ )

کاتێك کەسێك عاشق بێت جگە لە مەعشوقەکەی کەسی تر نابینێت و لە چاویدا تەنها ئەو هەیە وە لە ناو کۆمەڵێك کەسدا پێی وایە ئەو تاکە کەسە کە هەڵی بژاردووە و کەس هاوشێوەی ئەو نییە وە هەروەها لەگەڵ کەسدا بەراوردی ناکات . ( نیکخواە ، ٢٠١١ ، ص ١٠ )

لەگەڵ ئەوەی ناتوانن لە سەیرکردنی ژن یان پیاوێکی زۆر جوان بگوزەرێن ، ئەەر عاشق بن ، ئیتر سەیری کەس ناکەن و بەدوایدا ناگەڕێن ، تەنانەت ئەگەر لە خۆشەویستی ئێوە جوانتریش بێت . بە تایبەت حەز ناکەن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەربدوێن ، بەرە بەرە هەست دەکەن ئەو تەنیا کەسێکە کە سەرنجی ئێوە بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و ڕێك ئەو کەسەیە کە خۆشتاندەوێت . ( شەهدی ، ٢٠٠٨ ، ل ٥٢ )

٢) ئەگەر مرۆڤ لە قسەکانی عاشق ورد ببێتەوە ، دەبینێت بە زۆری باسی مەعشوقەکەی و ستایشی هەڵسووکەوتی خۆشەویستەکەی بەسەر زماندا زاڵە ، پێی بکرێت لە باسێکی پەیوەند بە ئەو زیاتر باسی هیچی تر نەکات ، تەنانەت قسە پێگوتن و بە خراپە ناوهێنانیش بێت ، مادام باسی ئەوە ، هەر باشە .

٣) عاشق هەمیشە حەز بە نزیکی مەعشوقەکەی دەکات و هەوڵی ئەوە دەدات بەرە و ئەو شوێنە بڕوات کە ئەوی لێیە ، لە کاتی ڕۆشتنیدا بەرەو لای زوو هەنگاو هەڵدەگرێت و بۆ ڕۆیشتن پەلە دەکات ، کەچی لە کاتی دابڕان و جیابوونەوەدا باری گران و هەنگاوەکانی قورس دەبن و زۆر بە ناڕەحەتیەوە دەڕوات و ڕێگە بڕینی لا سەختە . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٤٩ — ١٥٠)

کەسی عاشق هەوڵ دەدات کە بە ویست و حەزی مەعشوق ڕێ بکات ئەگەر ئەو شتانەش بە حەزی خۆی نەبێت ، بۆنمونە ڕۆشتن بۆ کتێبخانە یان پێشانگایەك کە مەعشوق بڕوات عاشقیش هەرچەندە حەزی لێی نییە و بە ویستی ئەم نییە بەڵام لەبەر مەعشوق دەڕوات و بە ویست و حەزی ئەو دەکات و هەوڵ دەدات وەك ئەو بێت . ( نیکخواە ، ٢٠١١ ، ص ١٠ )

٤) عاشق گازندە لە دەستی مەعشوقەکەی ناکات ، مەگەر تەنیا گازندە بکاتە بیانوویەك بۆ باسکردن و یادکردنی ، ئەگەر نا گلەیی ڕاستەقینە بەرامبەر خۆشەویستی ناخاتە ژێر ڕاپرسییەوە بەڵکو هەر باکیشی نییە خەڵك چی دەڵێن و چی ناڵێن . ( خورشید ، ٢٠١٤ ،ل١٥١)

٥) ئارام نەگرتن لەسەر خۆشەویستی نیشانەیەکی تری عەشقە ، عاشق هەرگیز ناتوانێت ئارام بگرێت لەسەر مەعشوقەکەی ، بەڵکو لە جێگەی ئەم ئارام گرتن لەسەر گوێڕایەڵی بۆ یار لەلا دروست دەبێت ، بۆیە ئەگەر مرۆڤ توانی لەسەر نەبینین و سەیر نەکردن و قسەنەکردن لەگەڵ مەعشوقەکەیدا ئارام بگرێت ، ئەوە هێدی هێدی خۆشەویستییەکەی نامێنێت بۆی ، بەڵام ئەمە بۆی عاشق زۆر سەختە . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٣ )

٦) لە نیشانەکانی عەشق ئەوەیە کە بەردەوام حەز لە گوێگرتن لە قسەی مەعشوق بکەیت و بە هەموو بیر و هۆشی گوێ بۆ وتەکانی شل بکەیت ، عاشق بە جۆرێك خۆی بۆ گوێگرتن لە مەعشوق یەکلایی دەکاتەوە کە هۆشی لای هیچی تر نامێنێت و دوور نییە وشە بە وشە قسەکانی مەعشوقی لەبەر بکات ، خۆ ئەگەر بێت و جار جار لابەلای یەکێکی تردا بکاتەوە ئەوە کارێکی خوازراوە و بە زۆر خۆی وا نیشان دەدات گوێ بۆ قسەی ئەویش دەگرێ ، ئەگەر نا لە ناخەوە بیری تەنیا لای مەعشوقەکەیەتی . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٤ )

وە هەروەها بەردەوام بیر لەو دەکاتەوە , بێ هیچ هۆکارێك دێتە بیرییەوە و پرسیار لە خۆی دەکات ئەرێ ئەویش بیر لە من دەکاتەوە ؟  بیر لەوە دەکاتەوە کە چی بە مێشکی ئەودا دێت , بیر لەوە دەکاتەوە کە پەیوەندی پێوە بکات , بەڵام ترسی ئەوەی هەیە کە ئەو ڕەتی بکاتەوە بۆیەش واز دێنێت . ( شەهدی , ٢٠٠٨ , ل ٥١ )

٧) عاشق گوێ ڕایەڵی کردنی مەعشوقی ئەوەنە لا خۆشدەبێت کە ئەگەر گرانترین کاری بۆ ئەنجام وا دەزانێت هیچی نەکردووە ، بەڵکو ئەگەر بزانێت ئەنجامدانی ئەو کارە دەبێتە هۆی دڵخۆشکردنی خۆشەویستەکەی ، ئەوە نەك هەر هەست بە ئەزێت و ئازار ناکات ، چێژ و تامیشی لێ دەبینێت و پێیشی دڵخۆشی دەبێت ، چونکە عاشق بە خۆشیکردنی مەعشوقەکەی خۆشی لێ دەبێت. ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٥ )

لەگەڵ ئەوەی حەزی لە هەندێ شوێن نییە بەڵام لەبەر دڵی ئەو بەلایەوە خۆشە و هـەوڵ دەدات کە بە دڵی ئەو بجوڵێتەوە و دوای ماوەیەك دەبیـنین کـە بـە دڵـی ئـەو هەڵسـووکەوت دەکـات و هاوسەنگییەك لە نێوانیان دروست دەکات . ( شەهدی , ٢٠٠٨ , ل ٥٣ )

٨) یەکێکی تر لە نیشانەکانی عاشق ، حەزکردنـە لـە تـەنیایی و بێـدەنگی ، زۆر جـار دەبینیـت کەسی عاشق و ئەویندار بە تەنیا لە ژورێکدا دانیشتووە و ئاوازێکی هێمنی دڵفرێنی خسـتووەتە سەر و لە جیهانی خەیاڵ و ئەندێشـەدا نغـرۆ بـووە ، یـان لـە نـاو ژوورێکـی پـڕ لـە مرۆڤـدا و لـە گەرمەی قسەکردنی خەڵکی تردا ئەو لە گۆشەیەکدا بێدەنگ بێدەنگ دانیشتووە ، یـا ڕاکێشـاوە و هەردوو دەستی خسـتووەتە پشـتە سـەری و لـە شـتێکی نادیـار دەڕوانێـت و ، ئاگایشـی لای هەراو زەنای ژوورەکە نییە . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٦ )

٩) جاری وا هەیە بە پێچەوانەوە عاشق زۆر بڵێ دەبێت و وای لێدێت بـوار بـە کەسـی تـر نـادات بدوێت ، بە تایبەت ئەگەر بێت و لەوە گومانی هەبێت کە مەعشوقەکەی ئەمی خۆشدەوێت یا نە ، لەم کاتەیشدا دەبینیت قسەکانی زۆر پەیوەندییان بەیەکەوە نییە ، جار جار خۆیشی نازانێت چی دەڵێت ! ئەو زۆر گوێگرتنەش تەنیا بۆ ئەوە بە خۆی سەرقاڵ بکات و کەمێك دڵەڕاوکێ لـە خۆی بڕەوێنێتەوە ، یا لە زۆری ڕاوەڕاوەیدا ناهی تێکدەچێت و ، زمـانی زۆر دەجوڵێـت ، ئـەم زۆر دەجوڵێت ، ئەم زۆر جوڵانە لە هەموو ئەندانەکانی تری لەشیشیدا دەبینرێت ، ئەڵبـەت ئـەم حاڵەتە تەواو پێچەوانەی حاڵەتی پێشوو ، کە عاشق لەوێدا حەزی بە کپی و ئـارامی و بێـدەنگی دەکرد . (خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٦ . )

١٠) گریان یەکێکی ترە لە نیشانە هەرە دیارەکانی کەسی عاشق ، مرۆڤ ئەگەر عاشـق بـوو دڵـی ئەوەندە ناسك دەبێتەوە کە بەبچووکترین وشە دەکەوێتـە دڵـی دادەخورپێـت و دەکەوێتـە ژێـر کاریگەری هەموو دیمەنێکەوە و فرمێسك لە چاوەکانی دەبارێتە خوارەوە ، وەکـو باسمـان کـرد چاوی عاشق بەردەوام پڕ لە فرمێسـکە و ئـەو دەریـا فرمێسـکەش ئامادەیـە وەك لێزمـە بـارانی بەهار دابارێت ، لە کاتێکدا کە فەرمان لە دڵی غەمگین و تەنگەوە بێت . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٥٧)

١١) عاشق لە ماوەی گڕگرتنی دەروونی بە ئاگری عەشق لە خەیاڵی مەعشوقی زیـاتر زەحمەتـە هیچی لەسەردا بێت ، هەرچەندە زۆریش لە خۆی بکات زۆر گرانە خەیاڵی ئەو لە مێشـکی خـۆی

بباته دەرێ ، ئەگەر چی بشزانێ پلانەکانی زۆر سەرکەوتوونین و ناتوانێت بگاتە ئامانجی خۆی ئەمەش زۆرجار کاتێك دەردەکەوێت کە عاشق گەیشتبێتە پلەی سێیەمی عاشقێتی و سووتاوی عەشق بێت . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٦٠ )

١٢) ئەویندارهەموو جێ و ماڵ و شاری خۆشەویستەکەی لە دڵدا شیرین دەبێت ، کەس و کاری مەعشوقیشی لا خۆشەویستی دەبێت ، تەنانەت ئەو جێگەیشی خۆشدەوێت کە جار جار مەعشوقەکەی لێ دانیشتووە . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ١٧٦ )

هەروەك ئیبن حەزم دەڵێت : (( کەسی عاشق هەموو ئەو کەس و کارانەی خۆشەویستەکەی خۆشدەوێت کە پەیوەندییان پێیەوە هەیە بە ڕادەیەك کە لە کەس و کاری خۆشی زیاتر خۆشی دەوێن )) . ( محمد ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥ )

هەر بۆیە کاتێك یەکێك بیەوێت خۆشەویستەکەی لەبیر بکات یەکێك لە چارەسەرەکان ئەوەیە کە ئەو شوێنە جێ بهێڵێت کە خۆشەویستەکەی لێیە ، چونکە بەم شێوە لەبیری دەکات . (نجار، ٢٠٠٩ ، ل ١٦٠ )

١٣ ) خەوتنی ناجێگیر و نائارام و ناهاوسەنگ دەکات هەروەها جۆرێك لە حاڵەتی هەستکردن بە خەفەت و خەمۆکی و دڵگیران بە جۆرێك نە تەرکیزکردنی و نە خەوی وەك جارانە ، بیری شڵەژاو دەبێت و تووشی کەم خەوی و لێدانی دڵ و قورسی لە هەناسەدانی بەدی دەکات بە شێوەیەك ژیانی بە هەموو وردەکارییەکانییەوە گۆڕانکاری ڕیشەیی بەسەر هاتووە . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٦٢ )

چەند لێکۆڵینەوەیەك دەریان خستووە کە ئەو کەسانەی دەکەونە داوای خۆشەویستییەوە هێندێ جار تووشی نەخۆشی درێژخایەن دەبن ، و لێدانی دڵیان زیاد دەکات ، پرۆفیسۆر ((کارتین کاوە)) کە توێژینەوەکەی ئەنداماوە ئەوەی دەرخست کە بەهۆی زۆری ئەو کێشانە و پەستانی زۆرەوە کە تووشی کەسی عاشق دەبێت ئەو کەسانە زیاتر تووشی ئەنفلۆنزا دەبن . (نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥٠ )

عاشقان تووشی دڵەڕاوکێ دەبن ، بەردەوام ڕاڕایین و دوو دڵ ، بە تایبەت وەك ئیبن حەزم باسی دەکات لە دو حالەتدا دڵەڕاوکێیان زیاد دەکات :




یەکەم : لە کاتی چاوەڕوانی دیداردا ، کە لە ناکاو ئاستەنگێك دێتە پێش و ترسی ئەوە دروست دەبێت دیدارەکە سەرنەگرێت ، ئیتر لە چاوەڕوانیدا دەبێت و لە دیداریشی دڵنیانییە .

دووەم : کاتێك کە مەعشوق گازندەیەکی لێ بکات و بۆمەی بکات ، هەر گورجێ و بێ ئەوەی هۆکارەکەی دەدۆزێتەوە ، ئەگەر ئومێدی لێبووردنی هەبوو ئەوە دڵی ئارام دەگرێت ، خۆ ئەگەر ترسی دابڕان و تۆرانی لا دروست ببێت ئەوە دڵەڕاوکێکەی دەبێتە پەژارە و قار و خەفەت . (الاندلسی ، ١٩٦٤ ، ص ١٦ – ١٧)

## * بنەماکانی خۆشەویستی :

خۆشەویستی پێویستە چەند بنەمایەکی تێدابێت ئەو کات ئەتوانین بڵێین کە خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەیە وە ئەم بنەمایانە چی لە نێوان کوڕ و کچ بێت یان لە نێوان هاوسەراندا پێویستە هەبێت ، چونکە بە نەبوونی یەکێك لەمانە خۆشەویستییەکە تەواو نابێت ، لێرەدا ئاماژە بە چەند پێویستییەك یان خاسیەتێك دەکەین :

### ١- پاکی :

هەندێ جار لە چاودا دیارە بە تەواوی ، بەڵام هەندێ جار خۆشەویستی چاوی بینینەکە کوێر دەکات ، وەك وتراوە خۆشەویستی کوێرە . ئەو دوو مرۆڤە کاتێك چاو بەرامبەر بە یەك هەڵدەهێنن پێویستە یەکەم شت کە لەبەر چاوی ئەگرن سێکس نەبێت ، حەز نەبێت ، چێژ وەرگرتن نەبێت ، بەڵکو پێویستە بیانەوێ داهاتوویەك بۆ یەکتری فەراهەم بکەن . ( شاسواری ، ٢٠٠٩،ل٧٥ )

دەبێت پرۆژەیەك بێت بۆ داهاتوو ، پڕ بێت لە چالاکی و پڕ دەستی بۆ داهاتوو واتە مەبەست لە بنەمای پرۆسەکە پێکەوەنانی کەژاوەی هاوسەرداری بێت نەك دەستگەرم کردنەوە و گوزەراندنی کاتێکی کەم بەیەکەوە . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل٨٠–٨١ )

بەڵام بەداخەوە لە هەندێ پرۆسەی سەرەتای یەکتر ناسینی نیوان کچ و کوڕدا کە پێیان وایە هەنگاو بۆ خۆشەویستی دەنێن ، سێکسکردن دەکەنە ئەولەویەتی قسەکردن و بە کردارکردنی پەیوەندییەکەیان ، بەو واتایەی پێدەچێت زۆربەیان پێکهێنانی پەیوەندییەکی سەرە ڕێی و خێرا و ماوە کورتیان پێ باشتر بێت لەو ڕوانگەیەی بەدوای چێژێکی دەستبەجێ و خۆشەویستییەکی ڕواڵەتکارانە بگەڕێن نەك خۆشەویستی ڕاستەقینە . ( دی بویسون ، ٢٠٠٨ ، ص ١١ )

## ٢- ڕێزگرتن :

ڕێزگرتن لە نێوان ژن و پیاو ( کوڕ و کچ ) و نەشکاندنی سنووری خۆیان بەرامبەر یەکتر یەکێکە لە خاڵە بەهێزەکانی ژیانێکی تەندروست و سەلامەت ، وە بۆ گەیشتن بەم خاڵە پێویستە ژن و پیاو (( کوڕ و کچ )) لەبارەی یەکترەوە شارەزایان هەبێت چونکە دونیای ژن و پیاو دونیایەکی جیاوازە هەر لە بیرکردنەوە و سەلیقە و داواکاری و .... هتد بۆیە بۆ ڕێزگرتن پێویستە شارەزای یەکتر بن و یەکتری بە باشی بناسن تاوەکو بتوانن یەکتری درك بکەن و هەست بە یەکتری بکەن . (حسین زادە ، ٢٠١٠ ، ص ١٦٤ )

پەیوەندی خۆشەویستی لەسەر بنەمای هاوڕێیەتی و ڕێزگرتن لە یەکتری بنیاد دەنرێت کاتێك کە ڕێزگرتن لە بوونی نەبێت گومان و دوو دڵی جێگای ڕێز و باوەڕ بە یەکتری دەگرنەوە ، بە تێپەڕبوونی کات بێزاری و توند و تیژی جێگایان دەگرنەوە . ( مورادی ، ٢٠٠٩ ، ل ٣٥ )

## ٣- خاکیەتی :

شتانێك کە دەبنە هۆی پەیدا بوونی خۆشەویستی ڕاستەقینە لەناوبردنی خودپەرستی و لووتبەرز و بەرژەوەندی خوازییە ناڕاستگۆییە لە دەروونی مرۆڤەکاندا . وە لەلایەکی کەشەوە خاکیەتی یەکێکە لە هۆکارە هەرە گرنگەکانی خۆشەویستی بە تایبەت بۆ کەسانێك کە دەیانەوێت خۆشەویستیان بچێتە دڵی کەسێکەوە ، سەیرکردنی کەسانی کە بە بایەخەوە و بە ڕێزەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسایەتی زۆر بەڕێز و بە شەخسیەتت هەبێت و خەڵکی ڕێزت لێبگرن ، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە خۆت پیشان بدەیت ئەوا وەك نیمچە پەرستراوێك




دەردەکەویت لای بەرامبەرەکانت ، جا کاتێك مرۆڤێك بە لوتبەرزییەوە ژیان دەباتە سەر ئەوا ناتوانێت لەگەڵ کەسانی تر بژی کە لە ئاستی خۆیدا نەبێت وە ناتوانێت بەرژەوەندی خۆی بخاتە دوای کەسانێکی ترەوە وە خۆشەویستی ڕاست و ڕاستگۆیان نییە بەرامبەر کەسانی تر ، بۆیە دەتوانین بڵێین کە خۆشەویستی و لوت بەرزی هەرگیز پێکەوە نایەن و پێچەوانەی یەکن.(ئۆکتار،٢٠١٤،ل١٧٣)

## ٤- ئارام گرتن :

ئەبێت تەنها تۆ لەو کاتانەدا کەسی بەرامبەرت خۆش نەوێت کە ئەو وێنەی دووەمی تۆیە ، تۆ چیت ئەوێ ، ئەو ئەوە بکات ، چونکە ئەگەر قسەیەکی کرد بۆ بەدڵت نەبوو یان هەر شتێکی تر کە تۆ حەزت نەکرد ، ئەو کاتە چی ، لەبەر ئەوەی ئاوا نابێت ، ئەبێ ئارام بگریت لەسەر ئەو شتانەی ئەو ئەیکات . ( شاسواری، ٢٠٠٩ ، ل ٨٤ )

جا کاتێك هەر مرۆڤێك ویستی لەسەر هاوڕێیەتی و خۆشەویستی یە لەگەڵ کەسانیتر پێویستە ئەم ڕاستییەی لەیاد بێت کە ئارام گرتن و لێبوردەیی بەرابمرە خۆشەویستەکانی پێویستە لە کاتێکدا هەڵەیەك ئەنجام دەدەن ، وە لە هەوڵدا بێت بۆ ئەوەی قەرەبووی هەڵەکانیان بکاتەوە چونکە تەنها کەسی ئارامگر خۆشەویستە و خۆشدەویسترێت ، ئارام گرتن خۆشەویستی هەردوولا بەهێز دەکات و لێخۆشبوون دەخاتە نێوانیانەوە . ( ئۆکتار ، ٢٠١٤ ، ل ١٧٩ )

## ٥- ڕاستگۆیی :

ڕاستگۆیی واتە دەرخستن و نیشاندانی هەستەکان ، ژن و پیاو (( کوڕ و کچ ))ی ڕاستگۆ بەو شێوە خۆیان نیشان دەدەن کە هەن و بیرکردنەوە و هەستەکانیان بە شێوەیەکی ڕاستی لەگەڵ یەك دەگۆڕنەوە ، ئەوان دڵنیان و ئارامن و نیگەرانی وەڵامی یەکتری نین وە دڵنیان لەوەی کە کەسی بەرامبەر هەوڵ دەدات لێی تێ بگات ، کاتێك ژن و پیاو (( کوڕ و کچ )) بیرکردنەوە و هەستەکانی خۆیان بە ڕاحەتی و ڕاستگۆیانە دەخەنە ڕوو ، لەگەڵ یەکتردا




هاوسۆز دەبن و گلەیەکان خۆیان دەخەنە ڕوو وە لە چارەسەرکردنی  ئەو گلەیانـە سـەرکەوتوو دەبن ، بۆیە ڕاستگۆیی لە پەیوەندی خۆشەویستی دا زۆر گرنگە. (اطلاعات ، ٢٠١١ ، ص٦ )




# بەشی چوارەم

- قۆناغەکانی خۆشەویستی
- جۆرەکانی خۆشەویستی
- زیانەکانی خۆشەویستی
- چارەسەری خۆشەویستی
- دەرئەنجام
- ڕاسپاردە
- پێشنیار
- سەرچاوەکان




# بەشی چوارەم

## * قۆناغەکانی خۆشەویستی :

چوار قۆناغمان هەیە کە ئەو مرۆڤانەی دەکەونە خۆشەویستییەوە پێی تێپەڕ دەبن ، ئەو قۆناغانەش بریتین لەمانەی خوارەوە :

### قۆناغی یەکەم : سەرنج ڕاکێشان و یەکتر کێش کردن

ئێمەی مرۆڤ ژیانمان بەندە بە چۆنیەتی خۆگونجاندنمانەوە لەگەڵ یەکتر ، بە تایبەت لەو کاتانەی بە کەسە نەناس و نامۆکان دەگەین ، کاتێك بە کەسێك ڕادەگەیت ڕاستەوخۆ ئەو کەسە هەڵسەنگاندنت لەو وشە و پەیڤەوە بۆ دەکات کە دەیوێژیت .

هەر بەیەك گەیشتنێکی نوێ یان هەلێکی زۆر گونجاوە بۆ سەنج ڕاکێشان یان هۆکارە بۆ کوشتنی سەرنجڕاکێشان ، ئەمەش ئاڕاستەی دوا ڕێڕەوت دەستنیشان دەکات ، یان ئەوەتا دەبێتە باشترین و خۆشەویستترین کەس بەلاتەوە یان ئەوەتا دەبێتە دوژمنت ، یان هەلێکی جوان دەبێت یان هەڕەشە ، یان دەبێتە هۆکاری خوو پێوە گرتن یان لێڕاکردنت . ( تانن ، ٢٠١٥ ، ل ٥١ – ٥٢ )

هەروەك دەڵێن : لە یەکەم نیگاوە خۆشەویستی دەست پێ دەکات ، زۆر کەم ڕێك دەکەوێت کەسێك عاشقی کەسێکی تر ببێت بێ ئەوەی بیبینێت یان زانیاری لەبارەیەوە هەبێت یان قسەی لەگەڵ کردبێت ، لەبەر ئەوە بینین مەرجێکی گرنگە لە دەستنیشانکردن و هەڵبژاردنی کەسێك بۆ خۆشەویستی ، چونکە خۆشەویستی دەکەوێتە ژێر کاریگەری بینین و قسە . (هیمەت ، ٢٠٠٦ ، ل ٣٥ )

### قۆناغی دووەم : پەیوەستبوون

ئاڕاستەکردنی هێما و ئاماژەی هەڵە یان بەکارهێنانی وشەی هەڵە وا دەکات هەموو کارەکان بە خێرایی ببڕێنەوە و ڕووبدەن دەکەوێتە نێو بیری لەبیرچوونەوە بەڵام ئەگەر ئاماژە و وشەکان بە ڕاست و دروستی ئاڕاستەی بەرامبەر کران ئەوا پەیوەستەی بە شێوەیەکی ئاسان




و هێـور دێتـه بوونـەوه ، دواتـر لـەم ڕێگەیـەوه دەگوازرێتـەوه بـۆ قۆنـاغی داهـاتوو .
( تانن ، ٢٠١٥ ، ل ٥٢ )

## قۆناغی سێیەم : هۆگری

سێیەمین گەوره هـەنگاوی ڕێگـای خۆشەویسـتی هۆگرییـه ، ئەمـەش لـەو دەمـەدا دێتـه بوونەوه کە هەلی دابەستنی گفتوگۆی گەرم لە نێوان هەردوو کەسـەکەدا هـەبێت ، هەریـەك لـەو دوو کەسـه بـەبێ قسـەکردن لەگـەڵ ئـەوی تـردا ناتوانێـت بحەسـێتەوه ، چـێژوەرناگرێت لـه قسەکردن لەگەڵ کەسی تر تەنها ئەو کەسه نەبێت کە دەستی گرتـووه بەسـەر هەسـت و بـیر و هۆشیدا . ( تانن ، ٢٠١٥ ، ل ٥٢ – ٥٣ )

بەلاّم هەندێ بووچوونیش هەیه کە پێـی وایـه خۆشەویسـتی و هۆگربـوون دوو شـتی جـودان لـه یەکترەوه ، هۆگربوون تاکلایەنەیه و بەنده بە ( من ) ەوه واته بـه منخوازییـەوه ، وه هـەروەها تەمەنی سنوورداره و کەمتره و پاش ماوەیەك کۆتایی پیێ دێت . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ٦٠ )

وێڕای بوونی جیاوازی کە لە نێوان هۆگربوون و خۆشەویستیدا هەیـه بـەلاّم دەتوانرێـت بوترێـت خۆشەویستی دەرەنجامی هۆگربوونێکی ساده و بەردەوامەوه دروست دەبێـت ئیـدی قۆنـاغ بـه قۆناغ بەردەوامیەتی دەبێت و گەشه دەکات و وا دەکات خۆشەویستی بێتە کایەوه . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ٦٣ )

## قۆناغی چوارەم : پابەندی

ئەم قۆناغە بریتییه لە پابەندبوون ئەمەش مانای وایه هەرلایەك پابەندی لاکەی تر بێت بـەم خاڵ و مەرجانەی خوارەوه :

- ♥ باش گوێ لێگرتن
- ♥ ئەوپەڕی هەوڵدان بۆ دڵ خۆشی
- ♥ دوندەی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی گفتوگۆیەکی درێژەپێدەری ژیان
- ♥ هەستکردن لە خۆشی و ناخۆشی یەکتر
- ♥ ئەنجامدانی هەموو ئەو کاره ڕێپێدراوانەی دەبنە هۆی چێژ لێوەرگرتنی کەسـی بەرامبـەر بـۆ ژیان




♥ دابین و پڕ کردنەوەی هـەموو پێداویسـتییەکانی ( دارایـی ، هەسـت و سـۆزی ) . ( تـانن ، ٢٠١٥ ، ل ٥٤ )

## * جۆرەکانی خۆشەویستی :

جیاوازی مرۆڤەکان لە رووی کەسـایەتی ، بـیر و بۆچـوون و دیـد و تێڕوانینەکانییـەوە وای کـردووە هەریەکـەیان باوەڕیـان بـە پیـادەکردنی جـۆرە خۆشەویسـتییەك هـەبێت یـان ئەگـەر پیادەشی نەکەن لە ژیانی کردەیی خۆیاندا دیـدی جیاوازیـان هـەبێت سـەبارەت بـە جۆرەکـانی خۆشەویستی نێوان دوو مرۆڤ . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٠٤ )

هەر بۆیە خانمە کۆمەڵناسـی ئـەمریکی نـەنس چـو دوورو دەڵێـت : مـن بـڕوان وایـە جۆرەکـانی خۆشەویسـتی کردنـی ئافرەتـان و پیـاوان هێنـدەی ژمـارەی ئافرەتـان و پیاوانـە و ناتوانرێـت شێوەیەك بەسەر هەمواندا بگشتێنرێت . ( کاستلز ،٢٠٠١،ص٢٧٨ )

ئەگەر بمانەوێت هەموو ئەو پۆلێنانەی کە تا ئێستا کراون لە لایەن توێژەرانـەوە بـۆ جۆرەکـانی خۆشەویستی باس بکەین ئەوە کارێکە لە مـەحاڵ نزیکمـان دەکاتـەوە ، چـونکە چـەند توێـژەر زۆربن لەم بوارەدا ئەوەندەش پۆلێن و ڕیزبەندی زیاتر هەیە بەڵام ئێمە هەوڵمانداوە کە بە پێـی بنەمای گشتی پۆلێن کردنەکان زۆرترین جۆرەکانی ڕاماڵ بکەین :

### - لەسەر بنەمای توانست و ئیرادە دوو جۆرە :

١ ) **خۆشەویستی ئیرادی**/ ئەمە چەند لێکدانەوەی بۆ دەکرێـت ، یەکـەمیان بـە هەڵبـژاردن پێـی دەگـات و بـۆ هاوسـەرداری هـەڵی دەبـژێرێت وە دووەمیـان هیچیـان عاشـق نـین بـەڵکو بـەپێی بارودۆخی ژیانی هەردوولا بڕیاریان هاتووەتە سەر ئـەوەی هاوسـەرگیری بکـەن . ( شاسـواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٣٤١ — ٣٤٢ )

وە یان کەسەکە خۆی هەوڵ دەدات گیرۆدەی کەسێك ببێت ، ئەم جۆرەیان ئەوەیە کە مرۆڤ بـۆ خۆی هەوڵ دەدات تاکو خۆشەویستی کەسێکی تر لە دڵیـدا بچەسـپێت و گـیرۆدەی بێـت ، وەك ئەوەی کوڕێك زۆر سەیری ئافرەتان بکات ، یان کچێك زۆر سـەیری کـوڕان بکـات ، یـان کتـێبی

عەشق و غەرامیات بخوێنێتەوە ، یان هەر شێوازێکی تر بێت ، جا ئەو خۆشەویستیەی بەم شێوە دروست دەبێت ، دروست نییە و لۆمە لێکراوە ، چونکە مرۆڤ بە دەستی خۆی خۆی گیرۆدە دەکات ، ئەوە بە دەستی خۆی ئازاری خۆی دەدات کە ئەمەش نابێت ، لەبەر ئەوەی دەبێت مرۆڤ هەوڵ بدات خۆی گیرۆدەی خۆشەویستی نەکات ، چونکە ئێستا زانستی سایکۆلۆژی ئەنجامدانی ئەو جۆرە خۆشەویستیانە بە خۆ ئازاردان و جۆرە نەخۆشییەکی دەروونی دەزانێت . ( نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل ٤٧ )

٢ ) **خۆشەویستی نا ئیرادی** / بە خواستی خۆی نەبووە ، بە یەکەم سەیرکردن تووشی بووە بێ ویستی خۆی ، هەر بە ڕاست عاشق بووە . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٣٤٢ )

واتە خۆی هەوڵی بۆ نادات ، وەك ئەوەی کوڕێك لە شوێنی کاری چەند جارێك چاوی بە ئافرەتێك دەکەوێت و خۆشەویستی دەکەوێتە دڵی ، یان ئافرەتێك بەو شێوەیە ، ئەم خۆرە لە ناخی سەر هەڵدەدات . ( نەجار ، ٢٠٠٩ ، ل ٤٨ )

**- لەسەر بنەمای مەرج بۆ خۆشەویستی کن کەیز دەڵێت دوو جۆرە :**

١ ) **خۆشەویستی بە مەرج** / ئەگەر ئەو مەرجە و ئەو مەرجەی تیابوو ئینجا دەمەوێ ، کە ئەمە وەك کڕین و فرۆشتن وایە .

٢ ) **خۆشەویستی بێ مەرج**/ واتە من تۆم خۆشدەوێت ، تەنها لەبەر ئەوەی کە هەیت ، سەرەڕای کۆی جیاوازییەکانمان ، ئێمە یەك کەسین ، خۆشەویستی ڕاستەقینە واتە : قبوڵکردنی خود و کەسێکی تر ، بە هەموو خراپەکانیەوە کە دەتوانێ تایبەتمەندی شیفای هەبێت .

**- خۆشەویستی لەسەر بنەمای حاڵ دوو جۆرە :**

١ ) **پێش هاوسەرداری**

٢ ) **دوای هاوسەرداری**

**- لەسەر بنەمای سروشتی کاراکتەرەکان ٩ جۆرە :**

١ ) خۆشەویستی لەلای ( أ ) دەگاتە پلەی شێتی بەڵام بەرامبەرەکەی ( ب ) خەمسارده .




٢ ) به نوقسانييەكەوە خۆشيدەوێ بۆ نمونە كچێك كوڕێكى خۆشدەوێت ( گەمژە ، شێت ، پـیر ، پياوكوژ .... هتد ) بێت .

٣ ) **خۆشەويستييەكىبێدەنگ**/ لەبەر خۆيەوە ئەسوتێ ، بـەلأم بێـدەنگى زۆرتـرين حيـوارى لـە خۆ هەلگرتووە . ( شاسوارى ، ٢٠٠٩ ، ل ١٤٥ – ١٤٦ )

كە ئەمە بە خۆشەويستى يەك لايەنە ناو دەبرێت ، كە لەوانەيە نەوێرێت ئەو كەسە دەرى ببڕێت و لەوانەشە لەبەر هۆكارى پەروەردەيى و دەروونييەكان ئەشێ ئەو كەسە بير و ڕاى جيـاوازى لا دروست ببێت . ( هيمەت ، ٢٠٠٨ ، ل ٤ )

٤ ) **خۆشەويستييەكى ماديیانە**/ وەك شتومەك سەيرى دەكات ، مادى لىَ برايە پيـاوى نازانێـت ، سەرەتاشى هەر بە پارە ئەو بڕيارە دەدات كە ئەمى بوێت يان كوڕەكە لەبەر چاوبڕينە مـالَى باوكى كچەكەوە خۆى خۆى لە كچەكە نزيك دەكاتەوە ئەگەر كچەكە دەولَەمەند نەبوايە هـەرگيز نەيدەويست . ( شاسوارى ، ٢٠٠٩ ، ل ١٤٦ )

ئەوە خۆشەويستييەكى زۆر خراپە هەر وەك ( گابريل گارسيا ماركز ) دەلَێت : خراپترين جۆرى بەدڕەوشتى خۆشەويستييە لە پێناو پارەدا . ( ماركز ، ٢٠١٠ ، ص ١٥ )

٥ ) خۆشەويستييەك وەلأمى پێداويستى ڕۆحـى دەداتـەوە بـەلأم لـە ڕووى پلـەى كۆمەلأيـەتى و ئاستى زانست و بوارى مادى گونجاو نييە ، ئەمانە قۆناغ بە قۆناغ بۆت دەردەكەوێت .

٦ ) **خۆشەويستى شۆك** / كەسێكى ئيزديواجيە و لە ڕوودا بـە كوريـەتى كەسـێكە و لـە پـەنادا و پاش بوون بە هاوسەرى كەسيكى ترە ، لە دوو كـاتى جيـادا دوو كاراكتـەرى جيايـە بـە هـەمان شێوە بۆ كچەكەش هەر ڕاستە بە كچيەتى و لە زەمـەنى ناسـينيدا سـەرەتا بـە شـێوازێك خـۆى دەردەخات كە لەگەلَ پاش هاوسەرداريدا ئاسمان و ئاسمايان بەينە !!

٧ ) **خۆشەويستى شەرم هێنەر** / ئەو كەسەى كە خۆشى ئەوێى هەلَسوكەوتى سـەيرى هەيـە پـڕ لە شەرمە لەگەلَيدا ژيان پڕ لە شەرمەزارييە هەر لە نان خواردنيەوە كـە چـەند پـيس خـۆرە تـا دەگاتە ميوانـدارى و پيەوەنديـە كۆمەلأيەتييـەكان ، لـە حالَـەتى سێكسـيش كەسـێكى شـاز و ئازاردەرە .




٨ ) **خۆشەویستی خەون ئاسـا**/ لەبەردەمتـدا دەوەسـتێت بـڕوای بـە خـۆی نییـە سـەلام بکـات وەڵامی دەدەیتەوە کاتێ تۆش هەنگاو دەنێی بەرەو ڕووی ئەو ئەڕوات و ڕادەکات ، ئـەم جـۆرە هەرچەند سەیرە بەڵام لە زۆر کچانا هەیە ، بەڵام لە هەر یەکێکیان و بە جۆرێك دەردەکەوێت .

٩ ) ئەو خۆشەویستییەی کە دێت و نازانی لە کوێوە هـات بـە کردارێـك یـان وتەیـەك وا کەمەنـد کێشت دەکات ئاشوفتەت دەکات ، کە قسـەت لەگـەڵ دەکـات لـە دڵـەوە ئـەیڵێ ، لـە پـەنهان و ئاشکرادا ڕێـزت دەگرێـت فێنکـت دەکاتـەوە وەك پـارێزە بەرووبەرهـەمی ئەرژێنێتـە ڕۆحتـەوە ، گیانت ڕووناك و ژیانت ئەکاتە چراخان . بەڵام لەم دەمەدا کەسێ پەیدا دەبێت و ئەڵێ : نەبووە و نابێ ئەم دووانە بۆ یەك ببن . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٣٤٦– ٣٤٨ )

## - لەسەر بنەمای تەمەن ٨ جۆرە :

١ ) کوڕو کچ بە منداڵی / کە ئاماژە بە خۆشەویستی منداڵی دەکات .

٢ ) کـوڕی لاو کچـی لاو بـە هـەرزەکاری / بـە بـزەو نوکـە و ژوان و دیـاری ، خۆشەویسـتییەکە دەگۆڕنـەوە و بـەردەوام ئـاڵوگۆڕی پـێ دەکـەن . ئـەم خۆشەویسـتییە بـە چـەندین شـێوەیەك دەکرێت بە سەرەتا بێت :

أ – **بە بینین** / واقیعی یان چات

ب – **بە قسە** / واقیعی یان مۆبایل

ج – **بە کردار** / واقیعی بێت یان خەیاڵ یان خەون

٣ ) **کوڕی گەورە + کچی منداڵ**

٤ ) **کوڕی منداڵ + کچی گەورە**

٥ ) **ژنی گەورە + کوڕی منداڵ** / کە ئەکرێ هەر ئەوەی خاڵی چوار بێـت و تـەحقیق نـەبوو بـە کچییەتی ئێستە مراجەعەی دەکاتەوە .

٦ ) **پیاوی گەورە + کچی منداڵ** / کە ئەکرێت هەر ئەوەی خاڵی سێیەم بێت و تەحقیق نـەبوو بە کوڕیەتی ئێستە مراجەعەی دەکاتەوە .

٧ ) **ژن و پیاوی پێگەیشتوو** / پاش هاوسەرداری ، هەنگا پێش خیانەت .

٨ ) **ژن و پیاو لە کاتی پیریدا** / کە ئەبنە سوتو و خوڵەمێشی عیشـق . ( شاسـوار ، ٢٠٠٩ ، ل ٣٥٨ )




**- له ڕووی نەخشەی دەروونیش ٤ جۆرە :**

١ ) **خۆشەویستی جەستەیی** / واتە وابەستەی بە جوانی جەستە و پێکهاتـە و ڕێکـی و توانـای وورووژاندن .

٢ ) **خۆشەویستی عاتیفی** / گرنگی دەدرێ بە هەست و نەست و ساتە وەختـی ڕۆمانتیکیانـە ، کە لە سەرووی جەستە و حەزە هەستییەکانە .

٣ ) **خۆشەویستی عـەقڵی** / ئـەو کەسـە هاوسـازی و گونجانێـك لـە عـەقڵی خۆشەویسـتیەکەی دەبینێ لە ڕووی نەشئەی هاوکۆلکی بـیری و لێتێنەگەیشـتن و بـەردەوام بـوون لـە گفتوگـۆ بـۆ چەند کاتژمێرێك .

٤ ) **خۆشەویسـتی ڕۆحـی** / خۆشەویسـتییەکە دوور لـە حـەز و ئـارەزووی جەسـتە و لـەش و پێداویستییە سۆزداری و عەقڵییەکان و ڕووەتێکی ڕۆحانی وەردەگرێت . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ٣٤٣ )

بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین خۆشەویستی بکەین بە ٥ جۆری سەرەکییەوە :

١ ) **خۆشەویستی تـاك لایەنە** / ئەم جۆرە خۆشەویستییە تۆ کەسێکت خۆشـدەوێت و ئـەمیش بە تۆ نازانێت ، دڵت بۆ یەکێك لێ دەدات کە هەست بە تۆ ناکات ، پێویسـتت بـە کەسـێکە کـە ئەو پێویستی بە تۆ نییە و لە بوونی تۆ بـێ ئاگایـە ، زۆر جـار ئـەم جـۆرە خۆشەویسـتییە بـۆ چەندین ساڵ درێژە دەکێشێت لەلایەن کەسێکەوە ، بە خەونی هێنانـە دی نـەوەکانی تەمـەنی بەڕێ دەکات ، بەبێ بوونی هێز و ئیرادەیەك خۆی دەداتە دەستەوە و ئاگاداری ئـەوەش نییـە کە تەمەن لە بەرژەوەندی ئەودا نییە ، خۆشەویستییەکەی تاك لایەنە خۆشـی دەوێـت ، بـەبێ هاوتای دەزانێت لە نێو هەموو ئەوانەی دیویەتی و هەموو ئەوانەش کە لەمەودوا دەیانبینێـت . ئەم خۆشەویستییە تەواو ئەو کەسە لە ژیانی ئاسایی دەبڕێنێت و واز لە هەرچی هەیـە دێنێـت بە خوێندن و کار ، تەواو لە ناخەوە تێك دەشکێت و تووشـی شـۆکی دەکـات و کەسـایەتی لـە نێو کۆمەڵگا دەشـێوێنێت ، زۆربـەی ئـەو قۆناغانـەی کـە مـرۆڤ تووشـی ئـەو خۆشەویسـتییەی دەبێت ، قۆناغی هەرزەکارییە ، کە هێشتا هەسـت و سـۆز و ئـاوەزی تـەواو پێنەگەیشـتووە . ( شوانی ، ٢٠٠٩ ، ل ١٠٥ – ١٠٦ )

ئەم جۆرە خۆشەویستییە وەك ئاماژەمان پێدا هەر لە ناوەکەیەوە دیارە یەکێك لەو دوو کەسە لە هەست و سۆز و خۆشەویستی کەسی بەرامبەر ئاگادار نییە یاخود قبوڵی نەکردووە ، ئەم جۆرە خۆشەویستیانە بە هیچ کوێ ناگەن ، چونکە لەم جۆرەدا عاشق لە خەیاڵیدا لەگەڵ مەعشوق قسە دەکات و لە جێی ئەو بیر دەکاتەوە و لە جێی ئەو بریار دەدات ، ئەم جۆرە خۆشەوستیانە بە خۆشەویستییەکی شکست خواردو دادەنرێن . (فریور.٢٠٠٩،ص١٢)

٢ ) **خۆشەویستی واقیعی** / خۆشەویستی واقیعی ئەوەیە کە عاشق سەرنج و ئاگاداری مەعشوقی حەقیقی بدات و زاتی ئەوی خۆش بوێت نەك بۆ ئەوەی بەهۆیەوە بگات بە شتێك بەڵکو تەنها لەبەر خودی خۆی ئەوی خۆشدەوێت بەبێ هیچ مەبەستێکی تر.  ( پارسانیا ، ٢٠٠٢ ، ص ٣ )

ئەگەر ئەو دوو کەسە لە هەر شتێکدا جیاوازبن ئەوە لە خۆشەویستیدا یەکسانن ، لەم پەیوەندییەدا پلە و پایە و بنەماڵە و خانەوادە و جیاوازی چینایەتی و ئایینی و نەتەوایەتی ئەم جیاوازیانە ، لە رووداو و دروستکردنیدا نە بریاردەرن نە لەمپەڕ و هیچیان پێ ناکرێت . (بۆکانی ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥٢ — ١٥٣ )

لە نیشانەکانی خۆشەویستی واقیعی (( هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی بەرامبەر بە یەکتر ، رێزگرتن لە یەکتر ، وەفاداری بەرامبەر یە یەکتری ، شادی و خۆشی ،  پێدانی ئازادی ، گرنگی دان بە یەکتر ، لە کاتی خۆشی و ناخۆشی لە لای یەك بن ، پارێزگاری کردن بەبێ هۆ و مەبەست و مەرج ، وە لە بوونی یەکتر خۆشحاڵ بن و چێژ وەربگرن .... هتد )).( فریور, ٢٠٠٩،ص١٢)

٣ ) **خۆشەویستی رۆمانسی**/ لەم پەیوەندییەدا هەریەك لەو دوو لایەنە رێز و شوێنێکی مەزن و تایبەتی دەبێت لای ئەویتر جگە لەوەی هەریەکەیان چێژ لە هێزێکی گەورە دەبینێت و ئەوەشە بە تایبەت کە هەریەك لەو دوو لایەنە چێژ دەدەن بە یەکتری و دەبێتە سەرچاوەیەکی هێز بۆ لایەنی دیکە . لە هەمان کاتدا بابەتی دڵدارییەکە دەبێتە سەرچاوەی ئازار کە لە رووی مەعریفییەوە دەبێتە هۆی ململانێ یان ناسەنگینی و نازیری . ( نظمي ، ٢٠٠٧ ، ص ١١٥ )

وە هەروەها زۆربەی ئەدەبیاتی نوێی دەروونناسی هاوران لەسەر ئەوەی خۆشەوستی رۆمانسی(( حاڵەتێکی سۆزی بەگۆژمە لە هەڵچوونیدا ، هاوکات هەستی توند و ناسك لە ناو

گێژەنگیدا سەرهەڵئەدەن : شادی لەگەڵ ئازاردا ، دڵەڕاوکێ لەگەڵ نائارامیدا ، خۆنەویستن لەگەڵ ئیرەییدا ، کامەرانی لەگەڵ خەم و پەژارەدا )) هەروەها (( حاڵەتێکی توندی پەرۆشی یەکبوونە لەگەڵ کەسێکی تردا )) ئەم سۆزەش ڕەگ و ڕیشەی هەیە لە هەردوو سیستەمی بایەلۆجی و کۆمەڵایەتیەکی گشتی بوونەوەرەکاندا . ( نظمي ، ٢٠١٠ ، ل ٥ )

٤ ) **خۆشەویستی بەتاڵ** / ئەو جۆرەی خۆشەوستییەیە کە ژن و پیاو کاتێك هەست بە خۆیان دەکەن پێکەوەن و بەبێ هیچ هەستکردنێکی پێشوەخت واتە حاڵەتێکی پێکەوە بوونە لە پەیوەندییەکی بەتاڵدا بێ هیچ قوڵبوونەوە یان ئارەزوویەك لەلایەن یەکێك لەو دوو لایەنە یان یەکێکیان ئەو باوەڕە لای خۆی دروست بکات کە کەسی بەرامبەری خۆش دەوێت یا وای داناوە ئەو هەستە لە پاش هاوسەرگیرییەوە دروست دەبێت یاخود زۆر جار دروست نەبوونی خۆشەویستی لە نێوانیاندا حاڵەتێکی بێزار بوون دروست دەکات . (عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٠٧)

بە بۆچوونی سترنبرگ لە دوو حاڵەتدا ئەم جۆرە پەیدا دەبێت :

**أ – هاوسەرگیرییەك کە بەبێ هەڵبژاردنی یەکتر بوبێت و بێ ویستی خۆیان هاوسەرگیریان کردبێت**

**ب – ئەو هاوسەرانەی کەساڵانێکی زۆر بەیەکەوە ژیاون ئیتر پەیوەندییەکی ڕاستییان لەگەڵ یەکتر نەماوە و ئەمە تەنها نەریتێکە کە لە ژیاندا هەیە ، لە ڕاستیدا ژن و مێرد لەم حاڵەتەدا تەڵاقی سۆزداری دراون لەلایەن یەکترییەوە** . ( Sternberg , ١٩٩٨ , p.٩٣ – ٩٤)

٥ ) **خۆشەویستی سێکسی** / بە بۆچوونی فرۆم ئەم جۆرە خۆشەویستییە هەوڵ دەدات بۆ یەکبوونی تەواو ، یەکگرتنی تەواو لەگەڵ کەسێکی دیکە . سروشتی ئەم چەشنە خۆشەویستیەیە تەرخان بۆ یەك کەس بەڵام بەرەهایی نییە ، دەشێ ئەم جۆرە خۆشەویستییە هەڵخەڵەتێنەرترین جۆری خۆشەویستی بێت . وە هەروەها ئەم ئەزموونە قوڵە و تاکاوە بە سروشت تەمەن کورتە . (فرۆم ، ٢٠٠٦ ، ل ٩١ )

وە هەروەها فرۆم دەڵێت : ڕاکێشانی سێکس بۆ ماوەیەکی کورت گومان لە پەیوەندی بۆ سێکسی مەعشوق بەهێز دەکات ، ئەوەش بریتییە لە لایەنە فریودەرەکانی شەهوەتی سێکس ، بۆیە هەموو ئامانجێك لەو پەیوەندییەدا دامرکانەوەی حەزێکی جەستەییە ، نەك پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ڕۆح ، ئینجا پاش دامرکانەوەی ئەو غەریزەیە لە جیاتی ئەوەی




ئەو دوو ڕەگەزە لە یەكتر نزیكتر بكاتەوە ئەوا ئەو دوو بێگانە بـە ئەنـدازەی پێشـوو لێك جیـا دەكاتەوە و زیاتر دووریان دەخاتەوە . ( محمد ، ٢٠٠٨ ، ل ١٦٩ )

## * زیانەكانی خۆشەویستی:

خۆشەویستیش وەك هەر بابەتێكی تر بەدەر نییە لـە لایـەنی خـراپ یـاخود زیـان ئێمـە لێرەدا هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەر هەندێك لە زیانەكانی خۆشەویستی ، ئەگەر بێت و كوڕ و كچ كە یەكیان خۆش بوێت بەهۆی هەر هۆكارێكەوە بێت بەیەك نەگەن كێشـە و گـیر و گرفـت دروست دەبێت چی لە ڕووی دەروونییەوە چی لە ڕووی كۆمەلأیـەتی و ئـابووری و ئـاینی و .... هتد ، لێرەدا ئاماژە بە چەند زیانێكی خۆشەویستی دەكەین :

### أ- زیانی جەستەیی و دەروونی :

وەك لە نیشانەكانی خۆشەویستیش ئاماژەمان پێدا ، كەسی عاشق خەوتنی ناجێگیر و نـا ئارام و نا هاوسەنگ دەبێت و هەروەها جۆرێك لە حاڵەتی هەستكردن بـە خەفـەت و خـەمۆكی و دڵگیران بە جۆرێك نە تەركیزكردنی و نە خەوی وەك جارانە ، بیری شڵەژاو دەبێت و توشی كەم خەوی و لێدانی دڵ و قورسـی لـە هەناسـەدانی بـەدی دەكـات ، بـە شـێوەیەك ژیـان بـە هـەموو وردەكارییەكانییەوە گۆڕانكاری ڕیشەیی بەسەر دێت . ( عبدالله ، ٢٠١٤ ، ل ١٦٢ )
چەند لێكۆڵینەوەیـەك دەریـان خسـتووە كـە ئـەو كەسـانەی دەكەونـە داوای خۆشەویسـتییەوە هێندێ جـار تووشـی نەخۆشـی درێژخایـەن دەبـن ، و لێـدانی دڵیـان زیـاد دەكـات ، پرۆفیسـۆر ((كارتین كاوە)) كە توێژینەوەكەی ئەنداماوە ئەوەی دەرخست كە بەهۆی زۆری ئەو كێشانە و پەستانی زۆرەوە كە تووشی كەسی عاشق دەبێت ئەو كەسانە زیاتر تووشـی ئـەنفلۆنزا دەبـن . (نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥٠ )




## ٢- لێکترازانی خێزان و خیانەت :

دەبینین زۆر خێزان یان پیاوەکە کەوتۆتە داوی دڵداری کەسێکی تـرەوە و هاوسـەرەکەی خۆی تەڵاق داوە یان ئافرەتەکە کەوتۆتە داوی دڵداری کەسێکی ترەوە و داوای تەڵاقی کـردووە لە پیاوەکەی . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٣١ )

یان یەکێك لـە هاوسـەرەکان پـەنا دەبەنـە بـەر خیانـەت ئـیتر ئـەم خیانەتـە مـەرج نییـە تـەنها پەیوەندی سێکسی بێت بەڵکو زۆر جار نامە و قسەی ڕۆمانسی بە ڕێگەی موبایل و چـات و .... دەبێت کە ئەمەش هەر خیانەتە کاتێك کـە هاوسـەرەکەی بەمـە دەزانێـت لێـی جیـا دەبێتـەوە چونکە ئەو متمانە و بڕوایەی کـە پێـی هـەبوو ئـیتر پێـی نامێنێـت کـاتێکیش متمانـە لـە نێـوان هاوسەراندا نـەما ئـەو کـات ئـیتر هـیچ هۆکارێـك نامێنێـت بـۆ مانـەوەیان بۆیـە جیـا دەبنـەوە . ( نیکویی ، ٢٠١٣ ، ص ١٠ )

لە ئەنجامی توێژینەوەیەکدا دەرکەوتووە ٢١ بۆ ٧٠ لەسەدی ژنان و ٢٦ بۆ ٧٥ لەسەدی پیـاوان لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ، بەلایـەنی کەمـەوە لـە ژیـانی هاوسـەرییاندا یـەك جـار پەیوەندی دەرەکی دەبەستن واتە لە دەرەوەی پەیوەندی هاوسـەری پەیوەنـدی تـر دەبەسـتن کە زۆربەیان پەیوەندی سێکسییە . (فتحی، ٢٠١٣ ، ص ١١٠ )

وە لـە کـاتی جیابوونـەوەی ئـەم هاوسـەرانەدا زەرەرمەنـدی یەکـەم منـداڵ دەبێـت کـە توشـی دڵەڕاوکێ دەبێـت وە هـەروەها هەسـتەکانیان تینـووی سـۆز و خۆشەویسـتی دەبێـت ، وە ئـەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە سەرووی (( ١٠ )) ساڵەوەیە لەوانەیـە پـەنا ببەنـە بـەر بـەکارهێنانی مادەی هۆشبەر و لە قوتابخانەیان دابڕێنێت . ( خلیل ، ٢٠٠٧ ، ل ٢٣٥ – ٢٣٦ )

## ٣- خۆ کوشتن و پیاو کوژی :

زۆر جار وا هەبووە بەهۆی دڵدارییەوە کچە یان کـوڕە خـۆی دەکوژێـت یـان لـە نێوانیـان کەسێك دەکوژرێت ، زۆر جار بەهۆی ئەو حەز لێکردن و دڵدارییەوە ئافرەتەکە ئابڕووی دەچێت یان دەبێتە هۆی کوشتنی کچەکە . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٤٣ )




عاشقان له كاتى ناكاميدا خۆيان دەكوژن يان كوڕان كەسێ دەكوژن كە بەربەستە لە ڕێیاندا یان فیتنەیەك بەرپا دەبێت زۆر لەوە زیاتر ڕوودەدات كە چاوەڕێ دەكرێت . (شاسواری،٢٠٠٩،ل١٥٦ )

یاخود کوشتن و لەناوبردنی کچەکە یان هەردووکیان کە لە کۆمەڵگەی خۆماندا نموونەی لەم چەشنە زۆرە ، ڕاستە ئەمە ڕاستەوخۆ دەرەنجامی خودی خۆشەویستییەکە نییە بەڵکو دەرەنجامی کاردانەوەی خراپی ئەو بنەماڵە و کۆمەڵگایەیە کە ئەو دوو عاشقەی تیا هەڵدەکەون کە بە ئاسانی خۆشەویستی نێوان کوڕ و کچیان پێ قبووڵ نییە ، بە ناوی نامووس پارێزی و پاراستنی شەرەفەوە کچەکەی خۆیان ئەکەنە قوربانی وە واش ئەزانن ئەمە هەڵقوڵاوی ئیسلامە کە لە ڕاستیدا وا نییە و ئەو کوشت و بڕەی کە لەسەر خۆشەویستی نێوان دووان یان تەنها لەسەر نامەیەك یان پەیمانێکی ئەویندارانە بۆ داهاتووی دوو عاشق هیچکات ئاین شتی وای نەوتووە و تەنانەت لە فەرموودەی ڕەسولی نازداردا پێچەوانەی ئەمەش هەیە و دەفەرموێت لە مارەکردن باشتر نییە بۆ دوو کەس کە یەکیان خۆش دەوێت . ( شاسواری ، ٢٠٠٩ ، ل ١٧٧ – ١٧٨ )

## * چارەسەر بۆ خۆشەویستی :

خۆشەویستی وەك هەر بابەتێکی تری دەروونی پێویستی بە چارەسەر هەیە بە چەندین ڕێگا و شێوازی جیاواز کە لە خوارەوەدا ئاماژەیان پێ دەدەین :

### ١) هاوسەرگیری :

ئەگەر ڕاستیمان بوێت تەنیا چارەسەری ڕاست و دروستی خۆشەویستی بە یەکگەیشتنی عاشق و مەعشوقەوە بە پەیوەندییەکی شەرعی و قانونی ، واتە هاوسەرگیری . چونکە مرۆڤ کە دەکەوێتە ناو خۆشەویستی کەسێکی ترەوە لە ڕەگەزی بەرامبەر ، ئەو کات ڕۆحی تێکەڵ بە ڕۆحی دەبێت و بەردەوام بە خەیاڵ لەلای ئەو دەژیت ، ئەگەر چی بەردەوامیش لە پێش چاویدا بێت سەبووری نایەت و دڵی ئارام ناگرێت ، چونکە بەردەوام ترسی ئەوەی هەیە لەدەستی دەربچێت و ببێت بە قسمەتی کەسێکی تر جا بۆیە ئەگەر بە شەرع و قەدەر هیچ مانع و




بەربەستێك لەبەردەم هێنانی مەعشوق و بەیەکگەیشتن لەگەڵیدا لە ژیانی هاوسەرێتیدا نەبوو ، ئەوە واجبی یەکەم و ئەرکی سەرەکی ئەوەیە بە زووترین کات ئەم دەرمانە بەکار بهێنرێت تا چیتر دوو مرۆڤ مێشك و وزە و توانایان بە هەدەر نەڕوات . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ٢٠٣ )

هەروەك (( أبن هبل البغدادی )) دەڵێت : چاکترین شت بۆ چارەی خۆشەویستی زەواجە ئەو زەواجەی کە خوای گەورە حەلاڵی کردووە . وە هەروەها (( سبگ الماردینی )) دەڵێت : چاکترین چارە بە یەك گەیاندنی عاشق بە مەعشوقە بە شێوەیەکی شەرعی . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥٩ )

## ٢ ) نائومێدبوون و دڵنیابوون :

ئەگەر هات و نەکرا پەیوەندی و خۆشەویستی نێوان عاشق و مەعشوق بە تاجی زێڕینی زەواج جوان بکەین و هەموو هەوڵێك لەم پێناوەدا بێسوود بوو ، ئەوە ئەو کات باشترین چارەسەر بۆ ئاسوودەکردنی عاشق و لە یادبردنی مەعشوق : (( نائومێدبوون و دڵنیابوونە لەوەی کە ناکرێت بەیەك بگەن )) . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ٢٣١ )

بێ ئومێد بێت لەوەی کە بە خۆشەویستەکەی دەگات ، بەڵکو ئەوەی دەیکات تەنها چەرمەسەرییە بۆ خۆی سازی دەکات بە جۆرێك بڕوانێت بۆ حاڵی ئەو کەسانەی کە تووشی ئەو خۆشەویستییە بوون کە بە ئاواتیان نەگەیشتوون ، دواتر یان خۆیان کوشتووە یا شێت بوون . (نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٦٠ )

هەرچەند هەندێ زانای دەروونناسی باوەڕیان وایە ئەویینی ڕاستەقینە هەردەژێت و دەمێنێتەوە ، تەنانەت ئەگەر هەردوو خۆشەویستەکەیش چارەنووسیان وابهێنێت کە هەریەکەیان لەگەڵ یەکێکی تردا ژیانی ژن و مێردی پێك بهێنێت . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ٢٣٤ )

## ٣ ) دوورکەوتنەوە لە مەعشوق و شوێن و وڵاتی :

سێیەم چارەسەری ئەوین و دەرمانی شڵەژانی باری دەروونی عاشق : دوورکەوتنەوەیە لە مەعشوق و شوێن و وڵاتی ، چونکە (( ئەوەی لەبەر چاوانە لەبەر دڵانە )) و مرۆڤ بە دوورکەوتنەوە لە هەر شت یان کەسێك وردە وردە جوانییەکانی لەبەر چاو ڕەش دەبێتەوە و

یادی لە دڵدا کەم دەبێتەوە ، تا دەگاتە ڕادەیەك هەستێکی دەروونی ئەوتۆی بۆ نامێنێت کە بە عیشق و شەیدای ناو ببرێت . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ٢٣٦ )

### ٤ ) سەرقاڵی و کارکردن :

خۆسەرقاڵکردن بە زانست و خوێندنەوەی کتێبی بەسوود ، کە دوور بێت لە غەرامیات ، چونکە مرۆڤ کاتێك خۆی سەرقاڵ دەکات بەوانە ، ئەو کات بیری لای مەعشوقەکەی نامێنێت و لەبیری دەکات . ( نجار ، ٢٠٠٩ ، ل ١٥٩ )

ئەرستۆ دەڵێت : (( عیشق نەزانییەکی لەناکاو هاتووە و لە دڵێکی بەتاڵدا ، کە هیچ کارێکی نییە تا سەرقاڵی بکات ، جێگیر بووە )) کەواتە سەرقاڵی و خۆ مەشغولکردن دەرمانێکی زۆر چاکە بۆ عیشق . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ٢٤٠)

### ٥ ) بیرکردنەوە لە کەم و کورتییەکانی مەعشوق و هێنانە پێش چاوی ناتەواوییەکانی:

ئەگەر ئەو چارەسەرانە کارساز نەبوون و بێ سوود بوون ، ئەو کات دەرمانێکی تر دێت ، ئەویش بیرکردنەوەیە لە کەم و کورتییەکانی مەعشوق و هێنانە پێش چاوی ناتەواوی و نوقسانییەکانی . ( خورشید ، ٢٠١٤ ، ل ٢٤٢ )

بۆ نمونە کاتێك ئازارێك یان ناڕاحەتییەك لەلایەن یارەوە پێ دەگات ، ئەوە دەبێتە فرسەتێك تا عاشق بیرێك لە عەیبەکانی یار بکاتەوە و لەگەڵ چاکەکانیدا بەراوردیان بکات ، هەرچەندە پێدەچێت هەندێ کەس بڵێن هەموو ئازاردانێکی مەعشوق لای عاشق هەر شیرین و خۆشە تا ڕادەیەك ڕاستیش بکەن ، بەڵام ئەو قسانەی کە دەڵێن ئەزێتدان و خۆشەویستی بەیەکەوە کۆنابێتەوە ، ڕاستییەکی زانستی (( دەروونناسی )) ڕاست و دروست دووپات دەکەنەوە . (نجاتی ، ب.س ، ص ٩٧ )

هەندێ لە زانایانیش وتوویانە هەر کەسێك بۆنێکی ناخۆشی بە خۆشەویستیەکەیەوە هات بە لوتیدا وای لێ دەکات کە خۆشەویستەکەی لەبەر چاو بکەوێت . ( الحمد ، ٢٠٠١ ، ص ٧٧ )




## ٦ ) تێکەڵاوی کردنی خەڵکی :

باشترین دەرمان بۆ کەسی دڵتەنگ و خەمۆك و گۆشەگیر کە تەنیایی تەواو باری گران کردووە ،(( بێگومان خۆشەویستیش کە نەکرێت بگۆڕدرێت بە زەواج یەکێکە لەو شتانەی مرۆڤ دڵتەنگ دەکات )) لەبەر چەند خاڵێك :

یەکەم : چونکە هۆکاری هەر نەخۆشییەك چی بوو ئەوە دەرمانی لە دژەکەی دایە ، مرۆڤ دڵدار کە تەنیا بوو بە زۆر بیر لە یارەکەی و خەمی فیراقی دەکاتەوە ، بۆیە بە دژی ئەمە [ واتە گەشت و دەرچوون و گەڕان چارە دەبێت ] .

دووەم : چونکە مرۆڤ کە تێکەڵاوی خەڵکی کرد زۆر شت دەبینێت و زۆریش فێر دەبێت ، دەزانێت کە مرۆڤەکان بیٚ کێشە و خەفەت نین و هەر کەسە و دەردێکی هەیە ، سروشتی مرۆڤ وایە کە بینی تەنیانییە و هاودەردی لە کۆمەڵگا زۆرە ، خەمی کەم دەکات و خەفەت دەڕەوێنێتەوە .




## * دەرئە نجام:

لە دوای تـەواو کردنـی توێژینەوەکـەمان گەشـتینە چـەند چـەنجامێك کـە لـە خـوارەوە بـە کورتی ئاماژەیان پیێ دەدەین :

١- خۆشەویستی هەستێکە کە هەموو مرۆڤێك هەستی پیێ ناکات بـەڵکو ئـەو کەسـانە هەسـتی پیێ دەکەن کـە چەشـتوویان و دەیچـێژن ، وە نـاتوانین پێناسـەیەکی دیـاری کـراوی بـۆ بکـەین چونکە بەقەد ژمارەی مرۆڤەکان ئەشێت پێناسەی خۆشەویستی هەبێت .

٢- خۆشەویستی لە ژیانی هەموو کەسێکدا پێویستە بەتایبەت لە نێوان هاوسـەراندا کـە ئەگـەر خۆشەویستی نەبێت ئەوە ژیانیان بەردەوام نابێت و بیێ بەش دەبن لە خۆشییەکانی ژیان .

٣- خۆشەویستی ئەگەر لە پێداویستییەکی بایەلۆجی زیاتر نەبێت ئەوە کـەمتر نییـە بـۆ ژیـانی هەریەکێکمان .

٤- ( حەز و خۆشەویستی و عەشق ) سیێ شتی جیاوازن و هەریەکەیان مەبەستێکی خۆی هەیـە کە ئەتوانین بڵێین : حەز تاکەکەسـییە و وەك نێرگـزی وایـە ، خۆشەویسـتی دوو کەسـییە و لـە نێوان دوو کەسدایە وە بەڵام عەشق لە نێوان کەسێك و خودادایە .

٥- خۆشەویستی و سێکس پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوانیان و تەواوکـەری یـەکترین ، بـە شێوەیەکە کـە سـێکس بـەبیێ خۆشەویسـتی هـیچ مانایـەکی نییـە و بـەردەوام نابێـت تـەنها بـۆ ماوەیەکی کاتییە ، بەڵام خۆشەویستی بەبیێ سێکسیش ئەبێت .

٦- خۆشەویستی ڕاستەقینە و خۆشەویستی درۆینە دوو شتی جیاوازن بەڵام زۆر جار بـە نـاوی خۆشەویستی ڕاستەقینەوە چـەندین کـاری خـراپ دەکرێـت و نـاوی خۆشەویسـتی پـیێ ناشـرین دەکـەن کـە لـە ڕاسـتیدا ئەمـە هـیچ کـات خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینە نییـە بـەڵکو خۆشەویسـتی درۆینەیە .




## * ڕاسپاردەکان :

لەدوای پشت بەستن بە ئەنجامەکانی توێژینەوە هەستاین بە دانانی چەن پێشنیارێك لەوانە:

١- ئاسانکاری بکرێت بۆ ئەو کەسانەی کە یەکیان خۆش دەوێت بۆ ئەوەی هاوسەرگیری بکەن و بەربەست و تەگەرە نەخەنە ڕێگەیان .

٢- پێویستە لەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندن کە فلیم و زنجیرەی ڕۆمانسی کەم بکەنەوە و لە جێگەی ئەوانە بەرنامەی زانستی و سوود بەخش پەخش بکەن .

٣- لەسەر مامۆستایانی ئاینی پێویستە کە بە شێوەیەکی باش چەمکی خۆشەویستی لە ئاینی ئیسلامدا ڕوون بکەنەوە و نەیکەنە هێڵی سوورەوە بەبێ تێگەیشتن لێی ، چونکە هەندێ مامۆستای ئاینی کاتێك کێشەیەکی خۆشەویستی دەچێتە لایان بەبێ گوێگرتن بۆ باسەکە ڕاستەوخۆ دەڵێن حەرامە !

٤- لەسەر دایك و باوك و پەروەردیارانیش پێویستە ئاگاداری منداڵەکانیان بن کە دووریان بخەنەوە لە هاوڕێی خراپ و چاودێری کردنیان لەکاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێت و تەلەفزیۆن و ..... هتد بۆ ئەوەی دوور بکەونەوە لە هەندێ شت کە زیان بە پاشەڕۆژیان بگات بەتایبەت چاودێری کردنیان لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێتدا چونکە سایتە سێکسییەکان ڕۆژانە بەرەو زیاد بوون دەچن و کاریگەری خراپ دەکاتە سەر ڕەوشت و کەسایەتی .

## * پێشنیارەکان:

لەدوای پشت بەستن بە ئەنجامەکانی توێژینەوە هەستاین بە دانانی چەن پێشنیارێك لەوانە:

١- توێژینەوەیەك ئەنجام بدرێت کە بە شێوەیەکی فراوان جیاوازی بکات لە نێوان خۆشەویستی ڕاستەقینە و خۆشەویستی درۆینە.

٢- توێژینەوەیەکی مەیدانی ئەنجام بدرێت لەسەر کاریگەری داب و نەریتی کۆمەڵگای کوردی و ڕەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندی خۆشەویستی .




## سەرچاوەکان :

- ( القرآن الكريم )
- ئینجیلی پیرۆز

## یەکەم / سەرچاوە کوردییەکان :


١. أبراهیم ، زەکەریا . ( ٢٠١٣ ) . کێشەی خۆشەویستی، وەرگێڕانی : محمد تاتانی ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی .

٢. أبراهیم ، شڤان . ( ٢٠١١ ) . عیشق لەبەردەم دادگای ویژدان، چاپی یەکەم ، چاپخانەی سیڤار ، سلێمانی .

٣. أوکتار ، عەدنان . (٢٠١٤ ) . خۆشەویستی خودا، وەرگێڕانی : ڕێبین طاهر، چاپی یەکەم ، چاپخانەی نارین ، هەولێر .

٤. بریکهاوس ، تۆماس و نیکولاس دی سمیس و کۆراب کارپۆفیچ . ( ٢٠٠٥ ) . ئەفلاتون، وەرگێڕانی : ئاوات ئەحمەد ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی سیما .

٥. بۆکانی ، سابیر . ( ٢٠٠٨ ) . ترس و خۆشەویستی، چاپی یەکەم ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی.

٦. تانن ، دیبۆرا . ( ٢٠١٥ ) . گفتوگۆی سەرکەوتووی نێوان ژن و مێرد . وەرگێڕانی : گەرمیان محمد أحمد ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی چوارچرا

٧. جرجیس ، ناصر . ( ٢٠٠٤ ) . خۆشەویستی قۆناغەکانی و پەرەپیدانی، وەرگێڕانی : کەمال علی ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی گەنج ، سلێمانی .

٨. حەمەد ، یوسف عوسمان . ( ٢٠٠٤ ) . سایکۆلۆژیەتی منداڵ و خێزان، چاپی یەکەم ، سلێمانی ، چاپخانەی دیلان .

٩. خلیل ، معن . ( ٢٠٠٧ ) . کۆمەڵناسی خێزان، وەرگێڕانی : گۆران جەمال ڕەواندوزی ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی خانی ، دهۆک .

١٠. خورشید ، هێمن . ( ٢٠١٢ ) . نەخوێندەواری لە زانکۆدا، چاپی دووەم ، چاپخانەی گەنج ، سلێمانی .




١١.ڕەفیق ، فاروق . ( ٢٠١٠ ) . هونەری عیشق، بەرگی یەکەم ، چاپخانەی سەردەم ، سلێمانی.

١٢.ریوریکوف ، یوری . ( ٢٠٠٩ ) . خۆشەویستی و وزەی دەروونی، وەرگێڕانی : سۆزان جەمال ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی کارۆ .

١٣.سالّح ، قاسم حسین . ( ٢٠٠٢ ) . مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆیدەوە، وەرگێڕانی : عبدالمطلب، چاپی یەکەم ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، سلێمانی .

١٤.سیوەیلی ، ڕێبوار . ( ٢٠٠٤ ) . لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی، چاپی یەکەم ، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ، هەولێر .

١٥.سیوەیلی ، ڕێبوار . ( ٢٠١٠ ) . لە پەیوەندییەوە بۆ خۆشەویستی، چاپی سێیەم ، چاپخانەی تەوار ، هەولێر .

١٦.شاسواری ، عادل . ( ٢٠٠٩ ) . گەنج و خۆشەویستی، چاپی یەکەم ، کتێبخانەی هەورامان.

١٧.شەحرور ، لەیلا . ( ٢٠١١ ) . ئاماژەکانی خۆشەویستی و خۆنزیککردنەوە، وەرگێڕانی : مونا ئاوات ، چاپی یەکەم ، چاپەمەنی گەنج ، سلێمانی .

١٨.شەهدی ، محمد . ( ٢٠٠٨ ) . پێگەی سێکس لە ژیانی هاوسەریدا ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی سەید برایم کۆیە

١٩.شوانی ، عبدولوەهاب حمد أحمد . ( ٢٠٠٩ ) . عەشق واتە ؟ ١+١=١، چاپی یەکەم ، چاپخانەی چوارچرا ، سلێمانی .

٢٠.طاهر، ڕێبین . ( ٢٠١٣ ) . خۆشەویستی و خۆشەویستی خودا، چاپی یەکەم ، چاپخانەی نارین ، هەولێر .

٢١.عبدالقادر ، گەشاو . ( ٢٠٠٧ ) . هەرزەکاران با خۆیان بدوێن، چاپی یەکەم ، وەزارەتی ڕۆشنبیری ، سلێمانی .

٢٢.عبدالله ، کنێر . ( ٢٠١٤ ) . تۆم خۆشدەوێت ئەی تۆ ؟!، چاپی یەکەم ، لە بلاّوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەلاّیەتی کەرکوك .

٢٣.غوتریج . ( ١٩٨٣ ) . دەروونزانی، وەرگێڕانی : هیوا عمر أحمد ، چاپی یەکەم ، چاپخانەی دار الحرية للطباعة ، بغداد .




٢٤.قەرەچەتانی ، کەریم شەریف . ( ٢٠٠٧ ) . سایکۆلۆژیای گشتی، چاپی دووەم ، چاپخانەی حاجی هاشم ، هەولێر .

٢٥.کـاپریز ، فرانـك .س . ( ٢٠١٢ ) . دەروونزانـی و ڕەفتـار بـۆ بـەرەو لوتکـەی کامـەرانی، وەرگێڕانی : سۆران خورماڵی ، چاپی شەشەم ، چاپەمەنی گەنج ، سلێمانی .

٢٦. کەریم ، سـەروەر . ( ٢٠٠٥ ) . عەشـق و خۆشەویسـتی لـە نێـوان وەهـم و واقیعـدا، چـاپی یەکەم ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی .

٢٧. کۆیلـۆ ، پـاولۆ . ( ٢٠٠٩ ) . یـانزە خولـەك، وەرگێڕانـی : ئـەیوب نـوری ، چـاپی یەکـەم ، چاپخانەی قانع .

٢٨. محمـد ، أحمـد . ( ٢٠٠٩ ) . خۆشەویسـتی و سـێکس و هاوسـەرگیری لـە نێـوان زانسـت و شـەریعەتدا، وەرگێڕانـی : حـاجی عبدولجـەلیل ، چـاپی یەکـەم ، چـاپخانەی ڕۆژهـەلآت ، هەولێر .

٢٩.نجار ، فرمان عزیز . ( ٢٠٠٩ ) . خۆشەویستی خوێندنەوەیـەکی شـەرعیانە و سـەردەمیانە، چاپی یەکەم ، کتێبخانەی نارین ، بەیروت .

٣٠.هیمەت ، فازیل . ( ٢٠٠٦ ) . خۆشەویستی سەرەتای هەموو شتێك و کۆتایی هەموو شتێك، چاپی یەکەم ، چاپەمەنی گەنج ، سلێمانی

## دووەم / سەرچاوە عەرەبییەکان :

٣١.ابراهیم ، زکریا . ( ب . س ) . مشكلة الحب، دار المصر للطباعة ، مصر .

٣٢.أبن ماجة ، أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني . ( ١٩٩٨ ) . سنن أبـن ماجـة، ط ١ ، مجلـد الثالث، دار الجيل ، بيروت .

٣٣. أحمد ، خديجة عابد و أبرار يوسف باعوق و أشخاص أخر . ( ٢٠١٠ ) . مقارنة بين الثقافـة الأسلام و الثقافة الغربية، منتشر جامعة طيبة .

٣٤.الأندلُسي ، أبي محمد علي بن حزم . ( ١٩٦٢ ) . رسالة الأخلاق، سلسلة الثقافية الأسلامية، دار الثقافية العربية ، القاهرة .




٣٥.الأندلُسي ، أبي محمد علي بن حزم . ( ١٩٦٤ ) . طوق الحمامة في الألفة و الألاف، مكتبة التجارية الكبرى ، قاهرة .

٣٦. الأهواني ، أحمد فؤاد . ( ١٩٥٨ ) . أفلاطون ( مجموعة نوابغ الفكر الغربي )، دارالمعارف.

٣٧. بن قاسم ، عبدالرحمن بن محمد . ( ٢٠٠٤ ) . مجموع فتاوى شيخ الأسلام أحمد بن تيمية، ج ١٠ ، مجمع الملك فهد ، سعودية .

٣٨. بُندُق ، صَهَباء مُحَمَد . (٢٠١٠ ). الحب كيف نفهمة و نمارسة ؟، ط ٣ ، دار السلام للطباعة ، قاهرة .

٣٩. بويسون ، ايمانويل دي . ( ٢٠٠٨ ) . اسرار دوام العلاقات، ط ١٠ ، شركة المطبوعات للتوزيع و النشر، بيروت .

٤٠.الجوزية ، محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم . ( ب.س ) . روضة المحبين و نزهة المشتاقين، ط ١ ، الناشر: مجمع الفقه الإسلامي بجدة .

٤١. الحمد ، محمد بن أبراهيم . ( ٢٠٠١ ) . العشق حقيقتة خطرة أسبابة علاجة، ط١ ، طبعة خاص بجهاز الأرشاد و التوجية .

٤٢.دريع ، فوزية . ( ٢٠٠٨ ) . سؤال في الحب، ط ١ ، الجزء الأول ، منشورات الجمل ، بغداد .

٤٣. راجع ، أحمد عزت . ( ١٩٦٥ ) . علم النفس العام، دار المصر ، قاهرة ، مصر .

٤٤.زينو ، محمد بن جميل . ( ب.س ) . تكريم المرأة في الأسلام، ط ١ ، دار القاسم ، السعودية.

٤٥. الصباغ ، عبدالرحمن . ( ب . س ) . كيف تحتار أصدقائك، دار العمر ، دمشق ، سورية .

٤٦. عبدالعال ، سيدة حامد . ( ١٩٨٥ ) .دراسة في علم الأجتماع النفسي، دار الفكر العربي ، القاهرة .

٤٧. علس ، عبدالرحمن . ( ٢٠٠٢ ) . علم النفس التربوي، دار اليسرة ، أردن ، عمان .

٤٨. علوان ، عبدالله ناصح . ( ١٩٨١ ) . الأسلام الحب، ط١ ، دار السلام ، الأصدار الأول .

٤٩. فروم ، أيرك . ( ١٩٨١ ) . فن الحب، ترجمة : مجاهد عبدالمضم مجاهد ، دار العدوة ، بيروت.

٥٠.منصور ، طلعت والأخرون . ( ١٩٧٨ ) . أسس علم النفس العام، مكتبة أنجلو المصرية .




٥١.نجاتي ، محمد عثمان . ( ب. س ) . علم النفس في التراث الأسلامي، ج ٣ ، ناشر المعهد العالمي للفكر ، أردن .

٥٢. نظمي ، فارس كمال . ( ٢٠٠٧ ) . الحب رومانسي بين الفلسفة و علم النفس، ط ١ ، دار أراس للطباعة و النشر ، أربيل .

## سێیەم / سەرچاوە فارسییەکان :

٥٣.رضائيان ، على . ( ٢٠٠١ ) . مديريت رفتار سازمانى، چاپ أول ، سمت ، تهران .

٥٤.شعيبى ، فاطمه . ( ٢٠١٣ ) . عشق أز ديدگاه روانشناسى و جامعه شناسى، چاپ أول ، نشر الكترونيكى : كتاب سبز .

٥٥.شعيبى ،فاطمه . ( ٢٠١٤ ) . أزدواج موفق، أنتشار الكترونى ، ناشر : پارسا بوك .

٥٦. گاست ، خوزه ئورتگاى . ( ٢٠٠٢ ) . درباره عشق، ت : سيد مهدى پريا ، أنتشار رشد ، تهران.

٥٧. فروم ، ايرك . ( ٢٠٠١ ) . هنر عشق و وزيدن، ت : پورى سلطانى ، تهران .

٥٨. كاستلز , نوێل . ( ٢٠٠١ ) . عصر اطلاعات , ترجمه : حسن چاوشيان,چاپ دووم , طرح نو , تهران .

٥٩. كوئيلو ، پائولو . ( ٢٠٠٠ ) . خاطران يك مرغ، ت : ارش حجازى ، كاروان ، تهران .

٦٠.ماركز ، گابريل گارسيا . ( ٢٠٠٦ ) . عشق در زمان و با، ت: بهمن فرزانه ، انتشار ققنوس، چاپ اول ، تهران .

٦١.مشيرى ، مشهيد . ( ١٩٩٧ ) . عشق و عرفان : فرهنگ قياسى، نشر البرز ، تهران .

٦٢. مشيرى ، مهشيد . ( ١٩٩٩ ) . نخستين فرهنگ زبان فارسى، سروش ، تهران .




## چوارەم / سەرچاوە ئینگلیزییەکان :

٦٣. ،CF. Ander Maurois .(N.Y ). cinq visagejde l'Amour Didier ch . III . Les Heroinse،New York

٦٤. ،CF.Morton M.Hunt . ( 1962 ) . The hatural History of love London.

٦٥. ، George ،Frome .A . (1960) . The ability to love . London Allon F unwin itd .

٦٦. V.L .(1978) . Bhaviour Research sournal of ،Hamilton no . 2 .، vol 3،Personality and social psychology

٦٧. Alboin ، san Francisco ، F . H . ( 1971) . Psychology،Harlow publishing company .

٦٨. C.S. Lewis . ( 1996) . Acompanion and ، walter ،Hooper Guide .

٦٩. Lamy . ( 2009) . L'impact du soutien social sur la ،Lubomir dans Jacques Lecomte (dir) . introduction a la ،santé Dunod . ، Paris ،psychologie positive

٧٠. ، Leon . ( 1908) . La Theorie Platoniciennede L'Amour،Rubin Paris .،F.Alcan

٧١. Journal of ، Z . ( 1970) . Measurment of romantic love،Rubin no 2 .، val 16،Personality of social Psychology

٧٢. z . ( 1973) . Liking and loving an invitation to social ،Rubin New york .،Psychology




٧٣. Sternberg، Robert J . ( 1986) . A triangular theory of love . psychological Review 93(2).

٧٤. Sternberg، Robert J . (1998) . The Triangle of love : intimacy، passion ، . New York . commitment

## پێنجەم / گۆڤار و ڕۆژنامەکان :

٧٥. اطلاعات . ( ٢٠١١ ) . صداقت در روابط زناشوی،مقاله منتشر شده در روزنامه اطلاعات ، شماره ٣٩٧٩ .

٧٦. پارسانیا ، حمید . ( ٢٠٠٢ ) . عشق چیست ؟، مقاله منتشر شده در مجله پرسمان ، شماره ٥ .

٧٧. حسین زاده ، علی . ( ٢٠١٠ ) . احترام به یکدیگر و نقش ان در زندگی مشترك، مقاله منتشر شده در فصلنامه معرفت اخلاقی ، شماره ١ ، زمستان ٢٠١٠ .

٧٨. سایك . ( ٢٠٠٦ ) . سێکس و خۆشەویستی , بابەتێکی بلاو کراوە لە گۆڤاری سایك , ژمارە ٧. تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦ .

٧٩. فتحی ، منصور و حسین فکر أزاد و أشخاص دیگر . ( ٢٠١٣ ) . عوامل زمینەساز بیوفایی زناشویی زنان، مقاله منتشر شده در فصلنامه علمی پژوه شیرفاه اجتماعی،شماره ٥١ .

٨٠. فریور ، میر عمادالدین . ( ٢٠٠٩ ) . عشق بر ١٠ نوع أست، مقاله منتشر شده در هفتەنامە سلامت ، شماره ٢٣٧ ، ٢٨ شهریور.

٨١. مجد، پروانه و أمید مجد . ( ٢٠١١ ) . نظریەی ( مثلث عشقی ) ( اشتنبرگ و انطباق أن با عقائد سعدی،مقاله منتشر شده در فصلنامه ( زن در فرهنگ و هنر ) ، شماره ٤ ، تابستان ٢٠١١.

٨٢. مورادی ، فەریبا . ( ٢٠٠٩ ) . عەشقی ڕاستەقینە یان عەشقی شەهوەتی ، بابەتێکی بلاو کراوە لە گۆڤاری وێ ، ژمارە ٢٢ ، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٩ .




٨٣. نظمي ، فـارس كمـال . ( ٢٠١٠ ) . سـايكۆلۆجيای خۆشەويسـتی لای ژنـان ، وەرگێڕانـی : سەلاّح گەرمیانی، توێژینەوەیەکی بلاّو کراوە لـە گۆڤـاری خـود ، ژمـارە ٤ ، مـانگی ٨ ی ساڵی ٢٠١٠ .

٨٤. نيكخواه ، هما . ( ٢٠١١ ) . دلایل علمی عاشق شدن، مقاله منتشر شده در روزنامـه شـرق ، شماره ١٤٦٥ ، ٢٥ بهمن .

٨٥. نیکویی ، محمد . ( ٢٠١٣ ) . خیانت أنلاین، مقالـه منتشـر شـده در هفتـه نامـه سـلامت ، شماره ٤٢٥ ، ٢٥ خرداد .

## شەشەم / ئینتەرنێت:

٨٦. www.psychology.about.com